# چیرۆکەکانی ڕێنمایی

نوسینی:
م. عەمر خالید



چاپی دووەم
2009

وەرگێڕانی: حسێن محمود هەڵەبجەیی

# چیرۆکەکانی ڕێنمایی

نوسینی:

م. عەمر خالید

وەرگێڕانی:

حسێن محمود هەڵەبجەیی

چاپی دووەم

٢٠٠٩

- ناوی کتێب: چیرۆکەکانی ڕێنمایی
- نووسەر: عەمر خالید
- دانان و ڕێکخستنی:فوزیة جذبة
- وەرگێڕ: حسێن محمود هەڵەبجەیی
- تایپ و دیزاین: شاخەوان غەریب
- شوێن و ساڵی چاپ: چوارچرا ٢٠٠٩ ز
- نۆبەتی چاپ: دووەم
- تیراژ: ١٠٠٠
- ژمارەی سپاردن: ( ٩١٠ )ی ساڵی( ٢٠٠٦ )ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

# پێشەکـــی

(وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلاَ أَنْ هَدَانَا اللَّهُ)

## چۆن ڕێنمایی کرام؟

لەژیانی هەریەکەماندا ساتێك هەڵوێستانێك هەن کە بەرەو باشتری دەبـات یـان بەرەو خراپتر، بێئاگان لەو ساتانەو بەبێ ئامانج ژیانی دەگوزەرێنیێ، یان دیمەنێك بینبێتی یان ڕۆژیەك خوا پێی بەخشیبێت یان ناڕەحەتیەك بەسەریدا هاتبێت دەبێتە خاڵێکی وەرچەرخان و بە ئاگا دێتەوە و دەگەڕێت بە دوای هۆکارێکدا بۆگـۆڕان، ئیتر لەو کاتەدا خوای گەورە دەستی دەگرێت و ڕێنمایی دەکات، بۆیە گـرنگیم دا بەوەی تەماشای ئەزموونی خەڵکی بکەم کە چۆن ڕێنمایی کراون، وە لە قورئانی پیرۆزدا نموونەی زۆر هەن تـا ئـەزموونی ئادەمیزادەکانمـان فێـر بکـات، کـاتێ تێڕامام لەو ئەزمونانە، و بە ووردی تەماشای ساتەکانی گۆڕانکاریم کرد لە ژیـانی مرۆڤەکاندا، بینیم کە مەزنترینی هۆکارەکانی ڕێنمایی ئەوەیە کە گـوێ بگریـت و تێبگەیت چۆن خەڵکانی تر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، ئەوکاتەش ڕێنمـایی ئـەوان ڕێنماییە بۆ تۆ.

بەم ووتە پرشنگدارانە دەست بەم کتێبە دەکەم و دەخـوازم لـە خـوای گـەورە بیکاتە توێشووی چاکەکانم لەو ڕۆژەدا کەماڵ و منداڵ سودی نیـە تـەنها کەسـێك نەبێت کە بەدڵێکی ساف و بێگەردەوە دەچیتە بەردەم بارەگای خوای باڵا دەست.

والسلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە

عمرو خالد

# باڵاپۆشـــی

ئەمـەوێ پـەیامێك بنێـرم بـۆ هـەموو خـەڵکی بـەو ئومێـدەی رێنوومـایی بێـت و تەوبـە بکـەن پـێش ئـەوەی کـات بەسەرچێت، وە دەمـەوێ ئـەو راستیە بڵێم کە مـرۆڤ لـە هـەموو شـوێنێکی ئـەم زەویـەدا بـە موسـڵمانی لـەدایك دەبێـت، وە ڕووی دەمـم ئاراسـتەی ئەوانـە دەکـەم کـە بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کەموسـوڵمانن، ئایـا بەڕاسـتی تـۆ وایـت؟ هەرچـی خـواو پێغەمبەرەکەی فەرمانت پـێ بدەن ئـەوە دەکـەیت یـان تـەنها بـە ناسـنامە موسڵمانیت؟

ئەمە بۆیادخستنەوەیە، بەڵام ئەو بەسـەرهاتەم کەپڕیـەتی لـە ماتـەمی و ناخۆشی بۆتانی دەگێڕمەوە لەڕێگەی سایتی مامۆستا عەمر خالیدەوە:

من ئافرەتێکی تەمەن بیست ساڵم و تاقانـەم، دایکم و بـاوکم بێجگـە لـە من کەسیان نیە، هەر لەوکاتەوەی فامم کردووەتـەوە لـە خۆشـگوزەرانیدا دەژیم و هەموو هۆکارەکانم لەبەردەستا بـووە، لـە قوتابخانـە بیانیەکانـدا خوێندوومە وە ئێمە بەزمانی عـەرەبی قسـە ناکـەین کـە زمـانی قورئـان و زمانی عەرەبە، تەنانەت لەماڵیشەوە، کەس و کارەکەم بەو زمانە قسەیان نـەدەکرد لەگەڵمـدا.. بۆچـی؟ نـازانم! بەنیـسبەت باوکمـەوە، دایکـی ئـەمریکی بـوو، بـاوکمی فێـری عـەرەبی نـەکردبوو هەرچـەندە باپیریـشم عـەرەب بـوو، بـەو شێوەیە هـەر لەمنداڵیـەوە وا ڕاهـاتبوو بـەزمانی ئێمـە لەگەڵماندا نەدوێ، ئەمەش یاسایەکی ستەمکارانە بوو کە سەپێنرابوو بەسەرمدا..

وورده ووردەگـەورە بـووم، دەم بینـی خزمـانم و ناسـیاوانم بـە زمانێـك قسە دەکەن کە من هیچیان لێ تێناگەم، کوڕان و کچانی مامم گاڵتـەیان پێ دەکردم چونکە نەم دەتوانی وەکو ئەوان بدوێم، ماتـەمی دایگـرتم و، ووتم بە باوکم کە فێری عەرەبیم بکات، دوای هەوڵێکی زۆر ڕازیم کرد، بـەڵام پێـی ووتم کـە نـابێ نـەنکم و بـاوام و دایکـم بەمـە بـزانن.. وورده وورده دەسـتم کـرد بـە فێربـوونی زمـانی عـەرەبی لای مامۆسـتایەکی ئـافرەت، وە هـەوڵم ئـەیا تـا فێـری ببم بۆ ئـەوەی ئـەو ئاینـەم بناسـم کـە بەهۆی بەخت ڕەشیمەوە کەس لە کەس و کارم فێری نەکردووم، کەس و کـارم لەسـەدا سـەد ژیـانێکی ڕۆژئاواییـان بەسـەر دەبـرد و هیـچیان لـە ئاینەکەیان و ئەوەی پەیوەندی بە ئاینەوە هەیە نەدەزانی.

ئەگـەر بهاتیتایەتـە ماڵمـان وات هەسـت دەکـرد دەچـیتە مـاڵێکی بیانیەوەو پڕ لەتاوان، مەشروبات و پۆشاکی ناشەرعی و ئاهانگانێك کە خواو پێغەمبەری خوایان توڕە دەکرد، بۆچی وایان دەکرد؟ چونکە لـەو ژیـارو کۆمـەڵگا مۆدێرنـەدا پیاوانـت دەبینـی لەگـەڵ ئافرەتانـدا سـەمایان دەکردو ماچیان دەکردن تاکو نیوەی شەو، وات هەست دەکرد تەماشـای فیلمێکـی ڕۆژئـاوایی بـێ شـەرمانە دەکـەیت بـەناوی شارسـتانی و پێشکەوتنەوە هـەموو ئەمانـە بەبەرچاوی منـەوە ڕوویـان دەداو هـەموان هانیـان دەدام کـەمنیش ئـەوە ئـەنجام بـدەم کـە ئـەوان دەیکـەن، تاببمـە کەسێکی مۆدێرن..

پـاش ماوەیـەك وورده وورده ڕاسـتێتی ئیـسلامم بـۆ دەرکـەوت، پەروەردگار چیم لێ داوادەکات؟ دەبێ بیپەرستم بە بەزارو بەکردار، وام لێهاتبوو بووبوومە مەترسیەکی گەورە بەسەریانەوە.. داوام لێکردن زۆر بەلێبڕاوانە کە پێویستە واز لەو کردەوە قیزەون و خراپانە بێنین کە پێـی

ەڵدەستن، دەنگم ووردە ووردە دلێرو دلێرتر دەبوو چونکە دەنگی
ەقە.. ویستیان بەچەندین ڕێگا بێدەنگم بکەن.

بێتاقەت نەبووم چونکە پەروەردگارم داوامان لێ دەکات کە بێتاقەت
ەبین و چۆك دانەدەین... لەگەڵ مامۆستاکەمدا کە فێری دەکردم چووم
ۆ بازاڕو حیجابێك و قورئانێکم کڕی و چووم بۆ ماڵیان و فێری
چۆنیەتی دەست نوێژو نوێژی کردم کە کەس و کارم نەیان دەزای،
چونکە سفری دوای ڤاریزەو سەرگەردان بوون و نوێژو ڕۆژوو زەکات و
حەجیان ئەنجام نەئەیا، چۆن منداڵ لەسەر ئەو نەریتە خراپە پەروەردە
ەکەن؟

بۆچی دەژین؟ تەنها بۆ کارکردن و خواردن و شەوانە بەسەربردن و
ابواردن... ئایا پەروەردگار بۆ ئەوەی دروست کردوون؟ بەڵێ
یروباوەڕیان بەو شێوەیە بوو بەبێ بەها یان ڕەوشت، بەڵام من
سوپاسێکی زۆری پەروەردگارم دەکەم کە ڕێنومایی کردم بەفەزڵی خۆی
ۆر بە جوانی وەڵامی دامەوە چونکە هەرگیز بەشداری کارە خراپەکانی
ئەوانم نەدەکرد وە هەروەها نەم دەویست خوا لەخۆم بڕەنجێنم چونکە
ۆرم خۆش دەویست بۆیە پابەندبووم بە نوێژو باڵاپۆشی و
خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزەوە، هەرچەندە قورئانم بەناڕەحەتی بۆ
ەخوێنرایەوە بەهۆی شارەزایی کەمم لە زمانەکەدا؛ شتێکی ناخۆش
ڕوویدا کە چاوەڕوانم نەدەکرد ئەویش ئەوەبو کە کەس و کارم زۆر
بەتوندی دژایەتی باڵاپۆشی منیان دەکرد و بەزۆر لەبەریان دادەکەندم و
پێیان دەوتم ئەگەر بەم پۆشاکە ناشارستانی و کۆنە پەرستی و
دواکەوتووەو بتبینین ئەوە خێرنایەتە ڕێت...

داواکاریەکەیانم قبوڵ نەدەکرد وە سووربووم لەسەرکاری خۆم، بۆیە باوکم هەڕەشەی لێ کردم ئەگەر بەو سەرسەختیەم بمێنمەوە ئەوە دەمنێرێ بۆ ئەو شارەی کە دایکی خۆیی لێیە تاخوێندنم لەوێ تەواو بکەم و بەتەنها لەوێ بم و بەبێ ئەوەی کەسیان چاودێریم بکەن..

چۆکم دانەدا لەبەردەم داواکاریەکانیان، مانم گرت لەخواردن و خواردنەوە بەڵکو دڵیان نەرم بێت و بانگم کەنەوەو ئەوەی پەروەردگارم و پێغەمبەرەکەی پێی خۆشە بیکەم.. بەڵام دڵیان دانەچڵەکا، بەڵکو منیان کردە قوربانی و ناردمیان بۆ وڵاتی کوفرو خراپەکاری و فڕێیان دام تاوەکو لەدەست دەرچم و نوقمی کارانێك ببم کە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامی بێت.. بەڵام پەروەردگارم لە گەڵمدابوو... دەست بەردارم نەبوو وە فڕێی نەدام وەك چۆن کەس و کارم وایان لێ بەسەرهێنام.. بەڵکو پەروەردگارم هاودەمم و یارمەتیدەرم بوو.. بەپەلە خۆم گەیاندە نزیکترین بنکەی ئیسلامی لەوێ و قسەم لەگەڵ هەندێ پسپۆڕدا کرد لەوێ، ئەوانیش سوپاسی زۆری پەروەردگاریان کرد کە من بیرم لەوان کردووەتەوە، منیش داوای کۆمەکیم لێ کردن و ئەوانیش هەرگیز کەمتەرخەمیان نەنواند لەگەڵمدا، بەڵکو پیاوێکی بەتەمەن کچێکی هەبوو لەتەمەنی مندا، ووتی: ئەو کچە وەك خوشکی تۆ وایە و فێری هەموو مەراسیمێکی ئاینیت دەکات، گەشتی نوێی پڕ لە ئیمانم دەستی پێکردو دڵم پڕ بوو لە خۆشەویستی پەروەردگار.. وە مامۆستا عەمر خالیدم بینی کە باسی ئەو هاوەڵەی دەکرد کە چۆن هەموو شتێکی لەپێناوی خوادا واز لێ هێنا، وەزۆر گریام چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆشی دەویست و شایەتی ئیمانی بۆدا بەهۆی خۆشەویستنی خواو پێغەمبەرەکەیەوە.. وە قورئانی زۆری دەخوێند، وە ئاواتەخوازم منیش

وەکو ئەو وابم بەکۆمەکی خوای پەروەردگار.. کەس و کارم هاتن بۆلام وکاتێ زانیان من پابەندم بە بالاپۆشیەوە شێت و هار بوون و قسەی ناشرینیان پێ ووتم.. باوکم پێی ووتم: ئەگەر واز لەم کارانەت نەهێنیت، ئەوە هیچ شتێکت پێ نایەم و لە هەموو شتێکیش بێ بەریت دەکەم.. پێم ووت ((إقض ما أنت قاض إنما تقضي هذه الحياة الدنيا)).

چفەرمانێك ئەدەیت بیدە، بێگومانبە لەوەی کە تۆ لەم دنیایەدا دەتوانیت فەرمان دەرکەیت چی ئەکەیت بیکە، ناگەڕێمەوە بۆ سەردەمی نەزانین کە تیایدا ئەژیاین، ئەو ڕۆژانەمان تێپەڕاند، من ئێستە بەختیارتین و خۆشترین و ڕێزدارترین ڕۆژەکانی ژیانم بەسەر ئەبەم، بەختیاریەك کە پێشتر نەم بینیوە، ناتوانی بەهیچ شێوەیە خوام لێ دوور بخەیتەوە.. من هەموو شتێك دەکەمە قوربانیی لە پێناوی ئەوەدا کە خوا لێم ڕازی بێت و بمخاتە بەهەشتەوە.. وە من لەم ماڵە سادەیەمدا لەلای ئەم پیاوە بەڕێزە، تکاو داوا دەکەم لە تۆو دایکم کە بگەڕێنەوە بۆلای خوا تەوبەیەکی یەکجارەکی بکەن، پێش ئەوەی لە کیستان چێت، بەڵام زۆر بەداخەوە گوێی لێ نەگرتم و قسەکانمی قبوڵ نەکردو بەجێی هێشتین بەبێ ئەوەی لا بکاتەوە.. وە من ئێستا لای ئەو پیاوە بەڕێزە ئەژیم بۆ پارێزگاریی لەسەر ئایین و ناسنامەکەم وەك ئافرەتێکی موسڵمان ڕێزم هەیە بۆی و پابەندم بە پۆشاکی شەرعیەوە کە پەروەردگارم فەرمانی پێداوم و نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و کەمێك لە داهاتم دەبەخشم و تێدەکۆشم لەپێناو ڕەزامەندی و خۆشەویستی پەروەردگاردا... من لەوپەڕی بەختیاریدام چونکە تام و چێژی شیرینی ئیمانم کردووە.

هەموو شتێك لەپێناوی خوادا بێت ئاسانە، ئەوەی لەگەڵ خوادابێت بێتاقەت نابێت چونکە هەمیشە لەگەڵتدایە بۆسەرخستنت، مادام تۆ بەردەوامیت لەسەرخستنی پەروەردگار.

داوا لەپەروەرەدگار دەکەم ڕاگیرو جێگیرم بکات لەسەر ئیمان و کردەوەی چاك، بەڕاستی پەروەردگار بیسەرو وەڵام دەرەوەیە.

# هیوەر مردنە

خالید لەنوسینگەکەیدا بەخەفەتباریی و غەم و پەژارەوە دانیشتبوو.. (صالح)یش کەهاوڕێی بوو لەسەر کار هەستی بەو ماتەمی و پەژارەییە دەکرد لە ڕوخساریدا، لەنوسینگەکەی هەستا و نزیک بوویەوە لە خالیدو پێی ووت: خالید ئێمە هاوڕێ و برای یەکترین پێش ئەوەی هاوڕێی سەرکاربین هەستم پێ کردویت نزیکەی هەفتەیەك دەبێت تۆ هەمیشە بیر دەکەیتەوە و زۆر بێزاریت و نیشانەی غەم و پەژارەیی لەڕووخسارتا دیارە، وەك ئەوەی غەمی هەموو دنیات هەڵگرتبێت.. تۆ باش دەزانیت خەڵك بۆ خەڵکە و هەموان برای یەکترن بۆ خوا.

خالید کەمێك بێدەنگ بوو پاشان ووتی: (صالح)ی هاوڕێم سوپاست دەکەم.. ئەمە هەستێکی جوانە... بێگومان من هەست دەکەم پێویستم بەکەسێك هەیە غەمەکانم و کێشەکانمی لا باس بکەم.. بەڵکو یارمەتیم بدات لەچارەسەرکردنیدا..

خالید لەدانیشتنەکەیدا ڕێك بوویەوەو کوپێ چای بۆ صاڵحی هاوڕێی تێکردوو پاشان ووتی: (صالح)گیان خۆت باش دەزانی من نزیکەی هەشت مانگە ژنم هێناوەو خۆم و خێزانم لەماڵێکدابن پێکەوە بەتەنها دەژین.. بەڵام کێشەکە لەوەدایە برا بچوکەکەم (حەمەد) کەتەمەنی بیست ساڵە.. دواناوەندی تەواو کردووە و لەزانکۆ وەرگیراوە لێرە، دوای هەفتەیەك یان دوو هەفتە یەت بۆ ئێرە..

تادریژە بە خوێندنەکەی بدات، لەبەر ئەوە دایکم و باوکم زۆر بەتوندی داوایان لێکردم کە (حەمەد) لەماڵی ئێمەبێت لەبری ئەوەی لەگەڵ هەندێ لەهاوڕێکانی لەشوقەدا بێت، چونکە دەترسان سەرەڕۆ بێت و لەدەست دەرچێت.. وەخۆت دەزانیت ئەو شوقانە هەموو جۆرە مرۆڤێکی تیادا کۆبووەتەوە لەباش و خراپ و بەڕەوشت و فەوتاو.. وەك دەزانیت هاوڕێ سەرنج ڕاکێشە.. منیش زۆر بەتوندی ڕازیی نەبووم چونکە وەك ئاشکرایە لەلات گەنجێکی هەرزەکارو بوونی لەماڵی مندا مەترسیەکی گەورەیە.. هەموومان بەقۆناغی لاوی و هەرزەکاریدا ڕۆیشتووین.. باش ئەزانین چۆنە.. هەندێ جار لەماڵ دەردەچم ئەو لە ژوورەکەیدا خەوتووە.. وە هەندێ جار بۆچەند ڕۆژێ لەماڵ دەردەچم بەهۆی بارودۆخی کارەکەمەوە.. و هەندێ جار.. و هەندێ جار... نایشارمەوە لەلات من پرسیاری زانایەکی بەڕێزی ئاینیم کرد لەم بارەیەوە.. ئەویش ئاگاداری کردم کە ڕێگا بەهیچ کەسێك نەیەم با برایشم بێت.. تابمێنێتەوە لەگەڵ من و لەگەڵ ژنەکەمدا لەماڵەکەدا.. وە باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ)ی بۆ کردم لەو بوارەدا کە دەفەرموێ ((الحمو الموت)) واتە ((هێوەر (شوبرا) مردنە)) واتە مەترسیترین شت بۆ سەر ژن خزمانی نزیکی مێردەکەن وەکو برای و مامی و خاڵی و کوڕەکانیان چونکە ئەو کەسانە زۆر بە ئاسانی دەچنە ماڵەوە و کەسیش گومانیان پێ نابات.. ئالێرەوە سەرگەردان بوون پێیان مەزنترو مەترسیدارترە.

پاشان شاراوە نیە لەلات کاك( صالح) کەپیاو دەیەوێ لەگەڵ ژنەکەیدا بەتەنها لەماڵێکدا بێ.. تا بەتەواوی بحەوێتەوەو بە شێوەیەکی باشتر بژین پێکەوە.. ئەمەش دەستەبەرنابێت ئەگەر (حەمەد)ی برام لەو ماڵەدا

بێــت، خالیــد کــەمێك بێــدەنگ بــوو پاشــان قــومێکی لەچــاکەیدا کەلەبەردەمیدابوو.. پاشان ووتی: کاتێ ئەمەم ڕوونکردەوە بۆ باوکم و دایکم و بۆچونی خۆمم بۆ شیکردنەوەو سوێندم بۆ خواردن بەخوای مەزن من هەموو کارێکی خێروچاك بۆ براکەم دەخوازم.. ئەوان توڕەبوون لێم و لای خزمان هێرشیان کردە سەرم، تۆمەتباریانکردم بەوەی کە ماقیانم نەداوە، وە بەوە وەسفیان کردم کە دڵم پیسەو نیەتم خراپە، چونکە گومانی خراپ دەبەم بە براکەم، لەکاتێکدا ئەو ژنی من وەکو خوشکی گەورەی خۆی تەماشا دەکات.. وە بەکەسێکی ئێرەیی پێبەر وەسفیان دەکردم و من چاکەی براکەمم ناوێت و نامەوێ خوێندنی زانکۆی تەواو بکات..

خراپتریش لەوە (صالح)گیان باوکم هەڕەشەی لێدەکردم و دەیوت: ئەمە فەزاحەتێکی گەورەیە لەناو خەڵکیدا.. چۆن براکەت لەگەڵ بێگانەدا بێت تۆش ماڵت لەوێ بێت.. بەخوا ئەگەر (حەمەد) لەماڵەکەی تۆدا نەمێنێتەوە من و دایکت لەمڕۆ بەدواوە تا دەمریت دەتبوغزێنین و ناتدوێنین و نەماندوێنیت.. ئێمە لەدنیاو لەقیامەتا بێ بەرین لەتۆ.. صالح کەمێك کێشای بەسەری خۆیداو پاشان ووتی: بێگومان تۆ ڕای منت دەوێت لەم مەسەلەیەدا و زۆر بەڕاشکاوانەو ئاشکرا.. لەبەر ئەوە(خالید) ڕێگام بدە پێت بڵێم تۆ کەسێکی دوودڵیت و ئەگەرنا پێویست بەو هەموو کێشەو ناکۆکیە ناکات لەگەڵ دایك و باوکت.. ئایا نازانیت ڕەزامەندی خوا لەڕەزامەندی دایك و باوکەوەیە، و توڕەبوونی خوا لەتوڕەبوونی ئەوانەوەیە، چی ڕوودەدات ئەگەر براکەت لەیەك ماڵدا لەگەڵ تۆدا بژی؟ کاتێ تۆ لەوێ نیت هەڵدەستێ بە کاروبارو

پێداویستی ماڵەوە بەهەر هۆیەکەوەبێت، کاتێ تۆ لەوێ نیت دەبێتە پیاوی ماڵەکە.

پاشان صالح کەمێك بێدەنگ بوو تا کاریگەری قسەکانی ببینێت لەسەر ڕوخساری خالید دوایی ووتی: پاشان من لێت دەپرسم بۆچی گومانی خراپ دەبەیت بە براکەت بۆچی بێ تاوانان تۆمەتبار دەکەیت بەبێ بەڵگە؟ ئایا بیرت چوو کە پەروەردگار دەفەمروێ (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ)الحجرات:١٢.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هەیە زۆر دووربکەونەوە لەگومان، بێگومان هەنێ لەگومانەکان تاوانن.

پێم بڵێ ئایا متمانەت بە ژنەکەت نیە؟ ئایا متمانەت بە براکەت نیە؟

خالید پێی بچڕی ووتی: من متمانەم بەژنەکم و براکەم هەیە، بەڵام..

صالح پێی بڕی و بە لۆمەوە ووتی: گەڕاینەوە بۆ گومان و خەیاڵی خراپ.. دڵنیابە خالید (حەمەد)ی برات دەبێتە شوانێکی دەست پاکی ماڵەکەت کاتێ تۆ لەوێیت و کاتێکیش لەماڵەوە نیت..

هەرگیز براکەت ڕێگا بە خۆی نادات نزیك بێتەوە لە براژنی خۆی چونکە وەکو خوشکی خۆی تەماشای دەکات. تۆ لەخۆت بپرسە (خالید).. ئەگەر (حەمەد)ی برات ژنی هەبوایە، ئایا تۆ بیرت لەدەستدرێژی دەکردەوە بۆسەر ژنەکەی یان زیانی پێبگەیەنیت؟

پێم وایە وەڵامەکە ئاشکرایە لەلات؟

خالید بۆچی براکەت و باوکت و دایکت لەدەست دەدەیت و خێزانەکەت پەرتەوازە دەکەیت لەپێناوی ئەندێشەو خەیاڵ و گومان و نەگەرانێکدا کە بوونیان نییە.. عاقڵبەو باوك و داکیت ڕازیکە تاوەکو خوای گەورە لێت ڕازی بێت.. وە بۆئەوەی گومان و دوودڵیت نەمێنێت

ڕێنماییت دەکەم کە (حەمەد) لەبەشی پیشەوەی ماڵەوە نیشتەجێ بکەیت، وە ئەو دەرگایەی بەشی پێشەوەو ژوورەکانی تر جیا دەکاتەوە دایبخەیت.. خالید ڕازیی بوو بە قسەکانی (صالح)ی هاوڕێی.. چارەی نەمابوو ڕازی بوون نەبێت بەوەی کە (حەمەد)ی برای بێنێتە لای خۆی..

دوای چەند ڕۆژێ (حەمەد) گەشتە فڕۆکەخانەو خالیدیش پێشوازیی لێکردو پاشان پێکەوە چوون بۆ ماڵی خالید تاوەکو (حەمەد) لەبەشی پێشەوە نیشتەجێ ببێت.. کار بەوشێوەیە گوزەرا.. ڕۆژگار بەویستی خوای گەورە بەسەرچوون کە هەر زاتی خۆی زانا بوو بە هەمووشتێ.. ئێستا ئێمە چوارساڵمان تێپەڕاندووەو خالید تەمەنی گەشتووەتە (٣٠) ساڵ و بووە بە باوکی سێ منداڵ..

(حەمەد)یش لە دواهەمین قۆناغی زانکۆدایەو خەریکە خوێندن تەواو دەکات.. خالیدی برای بەڵێنی پێداوە کە لەزانکۆ بیکات بە فەرمانبەر لە شوێنێکی گونجاودا.. وە هەر لەماڵیاندا بمێنێتەوە تا ژن دێنێت و لەگەڵ ژنەکەیدا دەچنە ماڵی خۆیانەوە.

ئێوارەیەکیان خالید بە ئۆتۆمبێلەکەی دوای نیوەی شەو دەگەڕایەوە بۆ ماڵ.. بەیەکێ لەڕێگاکانی گەڕەکەکەی تەنیشتی ماڵەکەیاندا دەڕۆشت... لە دوورەوە دوو تارمایی ڕەشی بینی کە لەتەنیشت ڕێگاکەدابوون.. نزیک بوویەوە لێیان.. بینی پیرەژنێکی بەتەمەنە لەگەڵ کچێکدا کە کەوتووە بە زەویداو کچەکە دەناڵێنێ و هاوار دەکات، پیرە ژنەکەش هاوارو واوەیلایەتی: (خەڵکینە پیاو چاکان فریامانکەون ڕزگارمانکەن)، خالید سەری سوڕما لەو حاڵەتە.. حەزی دەکرد زیاتر نزیک بێتەوە لێیان و پرسیاریان لێ بکات بۆچی لەقەراغ ئەو ڕێگایەدان، پیرەژنەکەش ووتی کە ئەوان خەڵکی ئەم شارە نین تەنها هەفتەیەک

نابێـت نیـشتەجێن لێـرەو کەسـیش لێرەناناسـن و ئـەم کـچەش، کـچی خۆیـەتی و مێردەکـەی سـەفەری کـردووە بـۆ دەرەوەی شـار بـۆ ئـیش کردن.. ئازاری ژان و منداڵ بوون، پێش وادەی دیاریکردنی خۆی زۆری بۆهێناوەو کچەکەی خەریکە لەتاو سەختی ئازار دەمرێت، و کەسیش شك نابەن بیانگەیەنێتە نەخۆشخانە تا لەویٚ کچەکەی منداڵی ببێت، پاشان پیرە ژنەکە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە لێی دەپاڕایەوە و دەیوت: تکات لیٚ دەکەم، قاچەکانت ماچ دەکەم چاکەمان لەگەڵدا بکەو کچەکەم بگەیەنەرە نزیکترین نەخۆشخانە، خوای گەورە خێزانت و منالەکانت لەهـەموو ناخۆشـیەك بپارێزێـت.. فرمێـسکی پیرەژنەکـەو هـاواری ئافرەتەکە کەکەوتبووبە سەر زەویدا کاریان کردە سەر دڵی خالید، بۆیە بەهۆی پیاوەتی و جوامێری و یارمەتی لێقەوماوانەوە بەزەیی پیایاندا هاتەوەو ڕازیی بوو کە بیانگەینێتە نەخۆشخانە، هەستا بەیارمەتیدانی پیرەژنەکـەو ئافرەتەکـەیان خـستە نـاو ئۆتۆمبێلەکـەوە پاشـان بەپەلـە گەیاندنیـە نـزیکترین نەخۆشـخانەی منـداڵ بـوون.. پیرەژنـەو ئافرەتەکـە بەدرێـژایی ڕێگاکـە دوعـای خێـرو سـەرکەوتنیان بـۆ دەکـرد کـە خـوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و منداڵیەوە.

دوای کـەمێك گەشـتنە نەخۆشـخانە، دوای تـەواوبوونی ڕێـو ڕەسمـی یاسایی لەو جۆرە حاڵەتانەدا ئافرەتەکە برا بۆ ژووری نەشتەرگەریی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری چونکە بەسروشتی منداڵەکەی نەدەبوو..

بەهۆی جوامێری و پیاوەتی و خاکیبوونیـەوە خالیـد حـەزی نـەدەکرد بڕوات و ئەو پیرەژنە هەژارە جیٚ بێڵێت لەگەڵ کچە بێچارەکەیدا بەتەنها، تا دڵنیا نەبێت لەسەرکەوتنی ئەنجامی نەشتەرگەریەکەو لـەدایك بـوونی منداڵەکـە بەسـەلامەتی.. بـە پیرەژنەکـەی ووت :ئـەم چـاوەڕوانی دەکـات

لەهۆڵی چاوەڕوانی پیاوان و داوای لێکرد ئەگەر نەشتەرگەریەکە تەواوبوو منداڵەکەش بەسەلامەتی لەدایك بوو مژدەی پێبدات.. بۆیە پەیوەندی بە ژنەکەیەوە کرد لەماڵەوەو هەواڵی پێدا کە کەمێك دوادەکەوێت و دڵنیای کرد کە دڵی هیچ نەکات.

خالید لەهۆڵی (چاوەڕوانی پیاوان) دانیشت و پشتی نا بەدیوارەکەوە ..بۆیە خەو زاڵ بوو بەسەریداو هەستی بەخۆی نەکرد.. خالید نەی زانی چەنێك بەسەر کاتەکەدا تێپەڕیوە کە خەوتووە.. بەڵام ئەوەی کە بەتەواوی لەیادی ئەمدا نەبوو کە هەرگیز لەبیروهۆشیدا ناسڕێتەوە کە بەهۆی دەنگی قیژەوە بەخەبەر هات.. بینی دوو پیاوی ئاسایش لێی نزیك دەبنەوەو پیرە ژنەکە هاوار دەکات و بەدەستەکانی ئاماژە بۆ ئەم دەکات و دەڵێ: ئەوەتا.. ئائەوەتا، خالید سەرسام بوو لەو هەڵوێستە و لە شوێنی خۆی هەستایەوەو بەپەلە چوو بۆلای دایکی کچەکەو دەست پێشخەری کردوو بەتاسەوە ووتی: ئایا منداڵەکە بەسەلامەتی لەدایك بوو.. پێش ئەوەی پیرەژنەکە هیچ بڵێت.. ئەفسەری ئاسایش لێی نزیك بوویەوەو پێی ووت: تۆ (خالید)یت ووتی: بەڵێ.. ئەفسەرە ئاسایشەکە پێی ووت دەمانەوێت پێنج خولەك بێیت بۆ ژووری بەڕێوەبەر..؟ هەموان چوونە ژووری بەڕێوەبەر دەرگاکەیان لەسەرداخستن.. لەوێ پیرەژنەکە هاواری دەکرد و دەیکێشا بە ڕووخساری خۆیداو ڕوومەت و قژی خۆیی دەڕنی و هاواری دەکرد: ئەوە تاوانبارەکەیە، داواتان لێ دەکەم دەست بەرداری مەبن با نەڕوات.. ئای داخی گرانم بۆکچی خۆم... خالیدیش سەرسام بوو بوو.. هیچ تێنەدەگەیشت چی ڕوودەدات.. هەر سەرسام و ئەبڵەق بوو بوو تا ئەفسەرەکە پێی ووت: ئەم پیرەژنە دەڵێت: تۆ زینات لەگەڵ

کچەکەیداکردووە و بە زۆر شەرەفت تکاندووەو سکی لەتۆ بووەو پاشان کاتێ کە هەڕەشەی لێ کردوویت کەنهێنیەکەت ئاشکرا دەکات و هەواڵ بە پۆلیس دەدات، تۆش بەڵێنت پێ داوە کە بیخوازیت، بەڵام پاش ئەوەی کە منداڵەکەی ببێت، پاشان منداڵەکە دابنێن لەبەردەم دەرگای یەکێ لەمزگەوتەکاندا تا خێرخوازێك بیبات و بیگەیەننە دەست خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی...!!! خالید بەبیستنی ئەم قسانە ڕاچڵەکی.. دنیا لەبەرچاوی ڕەش بوو.. هیچی نەدەبینی لەبەردەم خۆیدا.. قسەکان لە قوڕگیدا وشك بوو بوون نەیدەتوانی قسە بکات و کەوت بەزەویداو لەهۆش خۆی چوو، دوای کەمێك (خالید) هاتەوەهۆش خۆی و دوو پیاوی ئاسایشی بینی لەگەڵیدان لە ژوورەکەداو ئەفسەرە تایبەتمەندەکە پێی ووت: خالید ڕاستم پێ بڵێ: ڕوخسارت و سیمات وانیشان دەدەن کە تۆ کەسێکی بەڕێزیت و ڕواڵەتت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ لەو کارە قیزەونانەت ئەنجام نەیاوە..

خالید لەکاتێکدا ئازار سوێی بەدڵی بردبوویەوە ووتی: خەڵکینە ئایا ئەمە داپاشتی چاکەیە، ئایا بەو شێوەیە پاداشتی چاکە دەدرێتەوە، من پیاوێکی شەریف و داوێنپاکم، من ژنم هەیەو سێ منداڵم هەیە دوو کوڕم هەیە سامی و سعود و کچێك و نیشتەجێی ئێرەم لەگەڕەکێکی ناسراودا.. خالید نەیتوانی خۆی بگرێت و فرمێسك بەچاوانیدا هاتە خوارەوە.. ئەوانە فرمێسکی زوڵم و بێزاریی بوون.. فرمێسکی داوێن پاکی و ڕەوشت جوانی بوون.. پاشان کاتێ خۆی هێورکردەوە.. خالید بەسەرهاتەکەی خۆی بەتەواوی بۆ ئەفسەرەکان گێڕایەوە لەگەڵ ئەو پیرەژن و ئافرەتەدا..

کاتێ خالید لەقسەکانی بوویەوە.. ئەفسەرەکە پێی ووت :ئارامبە.. من دڵنیام کە تۆ بێتاوانی بەڵام پێویستە کێشەکە بەڕێگای یاسایی چارەسەر بکرێت و پێویستە بەڵگەی بێتاوانیی تۆ دەرکەوێت و کارەکەش ئاسانە لەم جۆرە حاڵەتەی تۆدا.. ئێمە تەنها هەڵدەستین بە هەندێ شیکاری پزیشکی تایبەت کە ڕاستیمان بۆ دەردەخات! خالید پێی بچڕی: چ ڕاستیەك، ڕاستی ئەوەی کە من بێتاوانم و شەریفم و داوێنپاکم.. ئایا بڕوام پێناکەن.. سەگیش چاکەی لەگەڵدا بکەیت چاك دەبێت لەگەڵت، بەڵام زۆرێك لەخەڵکی ناپاکی دەکەن و خراپەکار دەبن بەرامبەر کەسێ کە چاکەیان لەگەڵ بکات..

بۆبەیانی دەستیان کرد بە پشکنینی بڕێك لە (سپێرم) ی خالید و ناردیان بۆ تاقیگە بۆ پشکین و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی پێویست.. خالید لەگەڵ ئەفسەرە پسپۆڕەکەدا دانیشت کە لە ژوورێکی تردا بوو.. بەردەوام دووعای دەکرد و پەنای دەگرت بە خوا کە ڕاستی دەربکەوێت! دوای نزیکەی دوو سەعات ئەنجامی سەرسام هاتەوە.. شیکارە پزیشکیەکان دەریانخست کە خالید لەو تاوانە بۆ هەڵبەستراوە بێتاوانە.. خالید نەیتوانی لەخۆشیانداخۆی ڕابگرێت و لەسەر زەویەکە سوجدەی شوکری برد بۆ خوای گەورە، کە پەروەردگار بێتاوانی ئەمی دەرخست،ئەفسەرەکە داوای لێبووردنی کرد کە بوونەهۆی ناڕەحەتکردنی و پیرەژنەکەو کچە سۆزانیەکەیان نارد بۆ پۆلیسخانە بۆ بەدواداچوونی کێشەکەو گرتنەبەری ڕێ و شوێنی تەواو...

خالید پێش ئەوەی بڕواتە دەر لە نەخۆشخانە سوور بوو لەسەر ئەوەی خواحافیزی لە پزیشکی پسپۆڕ بکات کە هەستابوو بە کارەکە، بۆیە چوو بۆ ژوورە تایبەتەکەی تا خواحافیزی لێ بکات و سوپاسی هەوڵ و

ماندووبوونی بکات.. بەڵام پزیشکەکە پێی ووت: ئەگەر زەحمەت نەبێت چەند خولەکێك کارم پێتە بۆ شتێکی تایبەت.

پزیشکەکە کەمێك پەشۆکابوو پاشان خۆی ڕاگرت و ووتی: لەڕاستیدا لەمیانی پشکنینەکاندا کە ئەنجامم‌دا گومان دەبەم کە تۆ نەخۆشیەکت هەیە!!. بەڵام دڵنیا نیم لەوە، لەبەر ئەوە دەمەویٚ هەندیٚ پشکنین بکەیت لە سەر ژنەکەت و منداڵەکانت تاوەکو گومانەکە ببێت بەڕاستی؟؟

خالید کەمێك ترسی لیٚ نیشت و ووتی: تکات لیٚ دەکەم دکتۆر پێم بڵیٚ چیمە من ڕازیم بەقەدەری خوا، بەڵام گرنگتر لای من منداڵە بچوکەکانمە من ئامادەم لەپێناویاندا قوربانی بدەم، پاشان دەستی کرد بە گریان، پزیشکەکە دەستی کرد بە هێمن کردنەوەی و دڵنیا کردنەوەی و پێی ووت: من لەڕاستیدا ناتوانم ئێستا هیچت پیٚ بڵێم.. تا دڵنیا نەبم لە کارەکە.. لەوانەیە گومانەکانم لەجێی خۆیاندا نەبیٚ، بەڵام بەخێرایی ژنەکەت و هەرسیٚ منالەکەت بێنە.

دوای چەند سەعاتێك خالید ژنەکەی و منداڵەکانی هێنا بۆ نەخۆشخانە.. پشکنین و شیکاری پێویستیان بۆ ئەنجامدرا.. پاشان بە ئۆتۆمبێل ڕەوانەی کردنەوەو خالید خۆی گەڕایەوە تاکەمێك قسە لەگەڵ پزیشکەکەدا بکات.. کاتیٚ پێکەوە قسەیان دەکرد، مۆبایلەکەی خالید جەرەسی لێدا، ئەمیش هەڵیگرت و چەند خولەکێك قسەی کرد و دایخستەوە، دووبارە کەوتەوە ووت و ووێژ لەگەڵیداو پزیشکەکە پێی ووت: ئەوەکیٚ بوو پێت دەوت نەکەی دەرگای شوقەکە نەشکێنیت؟!!

خالید ووتی: ئەوە (حەمەد)ی برام بوو.. لەهەمان شوقەدا لەگەڵ مندا نیشتەجیٚ یە، کلیلەکەی خۆیی وون کردووەو داوام لیٚ دەکات بەخێرایی

بڕۆمەوە تا دەرگاکەی بۆ بکەمەوە.. پزیشکەکە بەسەرسامیەوە ووتی: لەکەیەوە ئەو لەگەڵ ئێوەدایە؟

خالید ووتی: چوار ساڵەو ئەو ئێستا لەقۆناغی کۆتاییدایە لەزانکۆ.. پزیشکەکە پێی ووت: ئایا دەتوانی بانگی بکەیت تا هەندێ پشکنینی بۆ بکەین تا دڵنیاببین ئایا نەخۆشیەکە زکماکیە یان نا؟! خالیدیش ووتی: زۆر بەدڵشادیەوە، سبەینێ دێینەوە بۆلات!!

لەکاتی دیاریکراودا خالیدو (حەمەد)ی برای ئامادەبوون لەنەخۆشخانەو پشکنین و شیکاری پێویست بۆ (حەمەد) ئەنجامدرا، پزیشکەکە داوای کرد لەخالید کە دوای هەفتەیەك سەردانی بکاتەوە تا ئەنجامی کۆتایی بۆ دەردەکەوێ و دڵنیا دەبێ لەهەمووشتێ..

خالید بەدرێژایی ئەو هەفتە ڕاڕاو بێتاقەت بوو.

لەکاتی دیاریکراودا هاتەوە بۆلای پزیشکەکە کە بەگەرمی پێشوازیی لێکرد.. داوای شەربەتێکی لیمۆی بۆ کرد تا مێشکی هێور بێتەوە.. پاشان وورده وورده باسی ئارامگرتنی بۆ دەکرد لەسەر نەهامەتی و کۆستەکان و دنیا هەر بەو شێوەیە بووە!! خالید پێی بڕی و ووتی: تکات لێدەکەم دکتۆر لەمە زیاتر دەمارم مەسوتێنە، من ئامادەم هەر نەخۆشیەکم تووش بووبێت چونکە ئەوە قەدەری خوایە، ڕاستیەکەم پێ بڵێ؟

پزیشکەکە کەمێك سەری لەقاندو پاشان ووتی: زۆرجار ڕاستیەکان ئازاراوی و تاڵ و ناخۆشن!!.. بەڵام دەبێ بزانرێن و بەرەنگاریان ببینەوە!!

ڕاکردن لەبەرەنگاربوونەوە چارەسەری کێشە ناکات و واقیعیش ناگۆڕێت..

پزیشکەکە کەمێك بێدەنگ بوو.. پاشان بۆمبەکەی تەقاندەوەو ورتی.
خالید تۆ نەزۆکیت و منداڵت نابێت!!! ئەو سێ منداڵەش منداڵی تۆ نین بەڵکو منداڵی (حەمەد)ی براتن... خالید نەیتوانی گوێ لەو قسە جەرگ برانە بگرێت... هاوارێکی بەرزی لێوەهات کە نەخۆشخانەکە دەنگی دەدایەوە، پاشان کەوت و لەهۆش خۆی چوو.
دوای دوو هەفتە خالید هاتەوە هۆش خۆی تا هەموو شتێك ببینێت لەژیانیداکە داڕماوەو تێکشکاوە.. خالید تووشی ئیفلیجی نیوەیی بوو بوو، عەقڵیشی لەدەست دابوو، بەهۆی سەختی کارەساتەکەوە، وە ڕەوانەی نەخۆشخانەی نەخۆشیە دەروونیەکان کرابوو، تا ژیانی لەوێ بەسەر بەرێ هەتا مردن.
ژنەکەشی ڕەوانەی دادگای شەرعی کرابوو بۆ دان پیانانی تاوانەکانی و ئەنجامدانی سزای ڕەجم کردنی هەتا مردن.
(حەمەد)ی برایشی ڕەوانەی بەندیخانەکرابوو چاوەڕوانی سزای شەرعی دەکرد، تا هەقی خۆی وەربگرێت.
سێ منداڵەکەش ڕەوانەی خانەی چاودێریی کۆمەڵایەتی کران تالەوێ لەگەڵ دۆزراوەکان و هەتیوەکاندا ژیان بەسەر بەرن.

# کوڕی قەشە

لەو فڕۆکەیەدا کە لە جدەوە دەیبردم بەرەو پاریس، دوای ئەوەی کە ناسیمەوە کەوتمە دواندن لەگەڵی، سەری شۆڕکردبووەوە بەسەر پاڵپشتی کروسیەکیدا، دەیەویست بحەوێتەوە، پێم ووت: أبو محمد سڵاوت لێ بێت، ئەوە لەکوێی پیاو، بەڕاستی ڕێکەوتێکی جوانە کە لەم فڕۆکەیەدا پێت دەگەم، نایەڵم بخەویت، ئێستە کاتی خەوتن نیە، ئایا نابینن ئەو میوانانە پێویستیان بە ئامۆژگاری و ڕێنومایی هەیە، هەستە شتێ پێشکەش کە بە ڵکو ئەمە خوایە بەهۆی تۆوە یەکێکیان ڕێنومایی بکرێت، ئەوکاتەش ئەو کارەت خێری لە هەموو دنیا زیاترە بۆ تۆ، ئایە ئێمە نەتەوەیەکی بانگخواز نین؟ خەو بۆچی؟ هەستە لەم ڕۆوە حەسانەوە نیە.

پیاوە چاوی بەرزکردەوە و ڕوانی پیاما، هەرکە ناسیمی هەستایە سەر پێ و ووتی: دکتۆر (سەرحان) بڕواناکەم!! من زەوی دەگەڕێم بە دواتا، کە چی لە ئاسماندا ئەتبینمەوە، سڵاو سڵاو، بڕوام نەئەکرد لەم فڕۆکەدا بتبینم، بەڵام لەڕاستیدا لەخەیاڵی مندا بوویت، وام گومان دەبرد کە لەفەرەنسا دەتبینم، یان لە باشووری ئەفریقیا، ئایا هەر لەوێ کار ئەکەیت و بەڕێوەبەری ئۆفیسیڕابیتەیت؟ بەڵام پێم بڵێ، ئەمە کاتانێکی جوانە دەتبینم لەم فڕۆکەیەدا لەبەردەممدا وەستاویت!!.. بڕوا بەچاوەکانم ناکەم.

بڕوا بکە، برای بەڕێزم، بڕوابکە، ئایا نامبینی لەبەردەمتا وەستاوم، بیر لەچی دەکەیتەوە، دەت بینم بیرت پەرتەوازە بووە..

بەڵێ بیرم دەکردەوە، لەو منداڵە دە ساڵانەی لە جوهانسبرگ بینیم کە موسوڵمان بووبوو، لەکاتێکدا باوکی کە قەشە بوو موسوڵمان نەبوو بوو.

–چی؟ منداڵێك موسوڵمان بووبوو، باوکیشی قەشە بوو.. هەستە.. خێرا هەستە.. ئەو بەسەرهاتەم بۆ بگێڕەرەوە، من بۆنی چیرۆکێکی‌خۆش دەکەم، چیرۆکێکی بۆندار، دە هەستە توخوا بۆم بگێڕەرەوە.

–چیرۆکێك سەمەرەتر لە خەیاڵ، بەڵام خوای پەروەردگار ئەگەر وویستی لەسەر هەر شتێك بێت دەیگوزەرێنێ، هەمووشتێك بەدەستی ئەوە، پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار، کێی بوێ ڕێنومایی ئەکات و کێی بوێ سەرگەردانی دەکات.

فەرموو ئەوە تۆو چیرۆکەکە:

لەشاری (جوهانسبرگ) بووم، جارێکیان لە مزگەوت نوێژم کرد، منداڵێکی دە ساڵانم بینی پۆشاکی عەرەبی لەبەردابوو، واتە پۆشاکی سپی، عەرەبی خلیجی بەسەرشانیەوە، وە چەفتەو عەگالێکیش بەسەریەوە..

دیمەنەکەی سەرنجی ڕاکێشام، عادەتی خەڵکی باشووری ئەفریقا نیە کە ئەو پۆشاکانە بپۆشن ئەوان پانتۆڵ و کراس لەبەر دەکەن، وە کلێتەیەکیش دەکەنە سەریان، یان ئەو پۆشاکە دەپۆشن کە موسوڵمانانی هیند و پاکستان دەیپۆشن.. بەلامدا ڕۆیشت و.. سڵاوێکی ئیسلامیانەی لێ کردم، منیش وەڵامەکەم دایەوە، پێم ووت:

تۆخـەڵکی سـعودیەیت؟ ووتـی: نـەخێر، مـن موسـوڵمانم خـەڵکی هـەموو وولاتێکـی ئیـسلامیم، سـەرم سـوڕما، لـێم پرسـی: بۆچـی ئـەم پۆشـاکە خلیجیەت لەبەرکردووە، وەڵامی دامەوە: چونکە شانازی پێوە دەکەم و ئەمـە پۆشـاکی موسـوڵمانانەیە، پیاوێـك بـەویادا ڕەت بـوو منداڵەکـەی دەناسـی، ووتـی: لێـی بپرسـە چۆن موسـوڵمان بـووە؟ سـەرم سـوڕما لـە پرسیاری پیاوەکە کە لەو منداڵە بپرسم چۆن موسوڵمان بووە.. ووتم بـە پیاوەکە: ئایا موسـوڵمان نیـە؟ پاشـان پرسـیارەکەم ئاراسـتەی منداڵەکـە کرد: ئایا تۆ پێشتر موسوڵمان نەبوویت؟ ئایا لـە خێزانێکـی موسـوڵمان نیت؟!!..

پاشان چەندین پرسیار هات بە مێشکمدا، بەڵام منداڵەکە پێـی ووتم: چیرۆکەکەت لەسەرتاوە بۆ کۆتایی بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام یەکەم جار.. پێم بڵێ تۆ لە کوێ وە هاتوویت؟

-من لە مەککەی پیرۆزەوە، هەر کە منداڵەکە گوێی لە وەڵامەکەم بوو کە من لە مەککەی پیرۆزەوە هاتووم، بەرەو ڕووم هات و وویستی باوەشـم پیادا بکات و ماچم بکات، وە هەر دەیوت: لـە مەککـەوە!! لـە مەککـەوە!! چـەندە دڵـشادم پیاوێـك ببیـنم کـە لـە مەککـەی پـیرۆزەوە لـە (بیـت الله الحرام)ەوە هاتبێت، چەندە حەز بە بینینی ئەو شارە دەکەم.

سـەرم سـوڕما لـە قسەکانی ئـەو منداڵـە.. پـێم وت: توخـوا بەسـەرهاتی خـۆتم بـۆ بـاس بکـە.. منداڵەکـە ووتـی: مـن کـوڕی بـاوکێکی کاسـۆلیکی قەشـەم، بـەڵام دایکـم لـەڕووی فێربوونـەوە گرنگیـەکی زۆری پـێ دەدام، هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ کەنیسە، وە پیاوێکی تـەرخان کردبوو کە فێرم بکات و پەروەردەم بکات، پاشان باوکم لە کتێبخانەی کەنیسەدا بـەجێی هێـشتم تـا تەماشـای گۆڤارەکـانی تایبـەت بـە منـداڵان بکـەم

ئەوانـەی نەخـشێنرابوون بـە چـیرۆکەکانی مەسـیحیەت، ڕۆژێکیـا ن کـە لەکتێبخانەی کەنیسەکەدا بووم، دەستم بۆ کتێبێك برد کە لەسەر یەکێك لـە ڕەفـەکانی کتێبخانەکـە دانرابـوو، ناونیـشانی کتێبەکـەم خوێنـدەوە تەماشام کرد ئینجیلە.. کتێبێکی کۆن بوو، حەزم کرد تەماشـای بکـەم و لاپەڕەکانیم هەڵدایەوە.. "سبحان الله" هـەر کە کتێبەکەم کـردەوە چاوم کەوتە سەر (هەر لەیەکەم ڕوانیندا) دیدێکی سـەیر، ئایـەتێکم خوێندەوە دەیـوت، ئەمـە وەرگێڕانەکەیـەتی: مەسـیح ووتـی: پێغەمبـەرێکی عـەرەب دوای من دێت نـاوی ئەحمـەدە، سـەرم سـوڕما لـەو ڕسـتەیە، بەپەلـە خۆم گەیاندە باوکم.. زۆر بەسادەییەوە لێم پرسی بەڵام بەسەرسوڕمانەوە!

باوکە، باوکە: ئەو ووتانەت خوێندووەتەوە، لەو ئینجیلەدا؟

باوکم ووتی: کام ووتانە؟

-لـەم لاپەڕەیـەدا ووشـەی سـەیر هەیـە.. مەسـیح تیایـدا ئـەڵێ: کـە پێغەمبـەرێکی عـەرەب دوای ئـەو دێـت.. باوکـە ئـەو پێغەمبـەرە عەرەبـە کێیە، کە مەسیح باسی دەکات کە دوای ئەو دێت؟ وە باسـی دەکـات کـە ناوی ئەحمەدە؟.. ئایا هاتووە باوکە، یان هێشتا نەهاتووە؟..

برایانم بڕوام پێبکەن.. حەزم دەکرد گەشتەکەم درێژە بکێشێت تـاوەکو بگەمـە کۆتـایی چـیرۆکەکە.. چـیرۆکەکەو بەسـەرهاتەکانی سـەرنجیان ڕاکێشابووم، هەر لەو کاتەوە کە (أبو محمد) دەستی پێ کردبوو..

ووتم: (أبو محمد) تەواوی کە، کات کەمە..

أبو محمد ووتـی: ئەگـەر دەتـەوێ تـەواوی بکـەم، پـێم مـەبڕە، پـێم ووت: نەرام بە أبومحمد، ئەمەوێ بەخێرایی بەتەواوی چیرۆکەکە ئاشنابم.. أبـو محمد ووتی: قەشەکە قیڕانـدی بەسـەر منداڵـە بـێ گوناهەکـەدا و هـاواری کرد: لەکوێ ئەم کتێبەت هێنا؟

-باوکە، لە کتێبخانەکە، کتێبخانەی کەنیسە، ئەو کتێبخانە تایبەتەی کە تیایدا دەخوێنیتەوە..

-ئەو کتێبەم نیشاندە.. هەر شتێکی تێدایە درۆیە و هەڵبەستراوە لەسەر مەسیح. بەڵام لەکتێبەکەدایە، لە ئینجلیلدایە، باوکە، ئایا نابینیت لە ئینجلیدا نوسراوە.....- تۆ چیت داوە بەوەوە، تۆ لەو کارانە تێناگەیت، تۆ هێشتا منداڵیت.. دەی بڕۆرەوە بۆ ماڵ.. باوکم دەستی راکێشام و بردمیەوە بۆ ماڵەوە، هاواری دەکرد بەسەرمداو بەڵێنی دەدا، کە واو وام لێ دەکات، ئەگەر واز لەوە نەهێنم..

بەڵام زانیم کە نهێنیەك هەیە و باوکم دەیەوێ لێم بشارێتەوە، بەڵام پەروەردگارم رێنومایی کردم کە دەست بە گەڕان بکەم بەناو شتە عەرەبیەکاندا، تا بگەم بە ئەنجام.. دەستم کرد بەگەڕان بەدوای کەسانی عەرەبدا تا پرسیاریان لێ بکەم، چێشتخانەیەکی عەرەبیم بینیەوە لە شارەکەماندا، چوومە ژوورەوە، پرسیارم کرد دەربارەی پێغەمبەرە عەرەبەکە، خاوەنی چێشتخانەکە ووتی: بڕۆ بۆ مزگەوتی موسوڵمانەکان.. لەوێ لە من باشتر باسی ئەوەت بۆ دەکەن.. چووم بۆ مزگەوت.. هاوارم کرد لە مزگەوتەکەدا: لەم مزگەوتەدا عەرەبی تێدایە.. یەکێکیان ووتی: عەرەبت بۆچی یە؟.. پێی ووتن: ((دەمەوێ پرسار دەربارەی پێغەمبەری عەرەبی ئەحمەد بکەم؟..) یەکێکیان پێی ووتم: (فەرموو دانیشە) دەتەوێ چی بزانیت دەربارەی ئەو پێغەمبەرە عەرەبە؟..) ووتی: ((خوێندوومەتەوە مەسیح لە ئینجیلدا دەڵێ: پێغەمبەرێکی عەرەب کە ناوی ئەحمەدە دوای من دێت، ئایا ئەمە راستە؟) پیاوەکە ووتی: (ئایا بەراستی ئەمەت خوێندەوە؟.. کورم ئەوەی تۆ دەیڵێیت راستە.. وە ئێمەی موسوڵمان شوێنکەوتەی ئەو

پێغەمبەرە عەرەبەین کە ناوی محمدە ﷺ وە قورئانی ئێمەش باسی ئەو شتەی کردووە کە تۆ باست کرد) منداڵەکە هاواری کرد.. وەك ئەوەی خۆی دۆزیبێتەوە: (ئایا بەڕاستە؟!!) (بەڵێ بەڕاستی.. کەمێك چاوەڕوانبە..) پیاوەکە ڕۆشت و تیراژێکی وەرگێڕدراوی ماناکانی قورئانی پیرۆزی هێنا.. لە سورەتی (الصف)دا ئایەتەکەی دۆزیەوە کە دەفەرموێ: ﴿ بشيراً برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد ﴾ منداڵەکە هاواری کرد: (نیشانم بدە..) پیاوەکەش ئایەتە تەفسیرکراوەکەی نیشاندا..

منداڵەکە هاواری کرد: (خوایەگیان هەمان نووسراوی ناو ئینجیلەکەیە.. مەسیح درۆی نەفەرمووە) بەڵام باوکم درۆی لەگەڵ کردم.. چی بکەم تا منیش ببمە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە (محمد ﷺ) پیاوەکە ووتی: پێویستە شایەتی بدەیت کە پەرستراو نیە بێجگە لە (اللە) وە محمد بەندە و پێغەمبەری خوایە، وە عیسا بەندە و پێغەمبەری خوایە، منداڵەکە ووتی: أشهد أن لا الـه إلا الله وأن محمداً عبده ورسوله، وأن عيسى عبده ورسوله).

حەزرەتی عیسا مژدەی هاتنی ئەم پێغەمبەرەی داوە کە ناوی (محمد ﷺ).. ئەمرۆ چەندە بەختیارم.. دەچم بۆ لای باوکم و مژدەی دەدەمێ) منداڵەکە بە دڵخۆشیەوە بەرەو لای باوکە قەشەکەی ڕۆیشت..

باوکە، باوکە، ڕاستیم بۆ ئاشکرابوو.. عەرەبەکان لە ئەمریکادا هەن و موسوڵمانیش لە ئەمریکادا هەن، وە ئەوان شوێنکەوتەی محمدن ﷺ وە قورئانەکەیانم بینی کە باس لە هەمان ئەو ئایەتە دەکات کە نیشانم دایت لە ئینجیلەکەدا.. من موسوڵمان بووم..

باوکە من ئێستە موسوڵمانم.. دەی تۆش موسوڵمان ببە لەگەڵم دەبێ شوێن ئەو پێغەمبەرە بکەویت کە ناوی محمد ﷺ.. عیسا لە ئینجیلدا وامان پێ دەڵێت..)

قەشەکە وەك هەورەگرمەیەك داباریبێت بەسەریدا.. منداڵە بچوکەکەی ڕاکێشاو خستیە ژوورێکی بچووکەوە و دەرگاکەی لەسەری داخست، و بەندی کرد..

داوای کرد بەزەیی لەگەڵیدا بەکار نەهێنرێت.. چەند هەفتەیەك لە بەندیخانەدا مایەوە.. خواردن و خواردنەوەی بۆ دەبرا، پاشان دەرگای لێ دادەخرایەوە.. کاتێك قەشەکە لەوەترسا کە کارەکەی لای حکومەت ئاشکرابێت –دوای ئەوەی لە قوتابخانەکەوە هەواڵی بۆ هات دەربارەی دیارنەبوونی کوڕەکەی– ترسا کارەکە تەشەنە بسەنێ.. و بەهۆیەوە بخرێتە بەندیخانەوە.. بیری لە دوور خستنەوەی کوڕەکەی کردەوە بۆ تەنزانیا لە ئەفریقیا، کە دایك و باوکی ئەم قەشەیە لەوێ دەژیان..

بۆیە لە ئەنجامدا ناردی بۆ ئەوێ، وە هەواڵی دا بە دایك و باوکی کە بەزەییان پیایدا نەیەتەوە.. ئەگەر منداڵەکە هەر سوور بوو لەسەر کەللە ڕەقیەکەی.. ئەگەر پێویستی کرد بیکوژن، ئەوە هەر لەوێ بیکوژن.. لە ئەفریقیا کەس بەدوایدا ناگەڕێت!! منداڵەکە سەفەری کرد بۆ تەنزانیا، بەڵام ئیسلامی لە یاد نەکرد.. لەوێش بەدوای موسوڵمانەکاندا دەگەڕا، تا مزگەوتێکی بینیەوە و چووە ناوەوەو لەگەڵ چەند موسوڵمانێکدا دانیشت و باسی خۆیی کرد بۆیان.. ئەوانیش سۆزیان نواند بەرامبەری.. وورده وورده فێری ئیسلامیان کرد، بەڵام باپیری بەکارەکەی زانی.. بۆیە گرتی و بەندی کرد وەك چۆن باوکی پێشتر وای لێ کرد..

پاشان دەستیکرد بە سزادانی منداڵەکە.. بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لە پەشیمان کردنەوەیدا، وەنەی دەتوانی ڕێگای خواپەرستی لێ بگرێت، بۆیە بەندکردنی و سزادانەکەی زیاتر ئیمانی منداڵەکەی پتەو دەکرد و زیاتر هۆگری پەروەردگار دەبوو، لەکۆتاییدا باپیری وویستی ڕزگاری بێت لیّی، بۆیە ژەهری کردە خواردنەکەیەوە.. بەڵام پەروەردگار هات بەهانایەوە و بەو تاوانە نامرۆییانە تیا نەچوو.. دوای ئەوەی کەمێکی لە خواردنەکە خوارد هەستی کرد کە گەدەی ئازاری ئەدات و خۆی ڕشاندەوە، پاشان لەو ژوورەیدا کە دەیڕوانی بەسەر بەلە کۆنەکەدا لەوێشەوە بۆ باخچەکە خۆی هەڵدا.. بەخێرایی ڕایکرد.. چوو بۆ لای کۆمەڵی ناو مزگەوتەکە، کە ئەوانیش بە خێرایی چارەسەری پێویستیان بۆ ئەنجامدا.. تا خوای پەروەردگار شیفای تەواوی بۆ نارد.. پاشان پێی وتن کە لای خۆیان حەشاری بدەن.. پاشان لەگەڵ یەکێکیاندا بەرەو ئەسیوبیا ڕفاندیان.. لە ئەسیوبیا لە سەردەستی ئەم منداڵە دەیان کەس موسوڵمان بوو، بانگی دەکرد بۆ ئیسلامەتی.. (چی؟.. دەیان کەس لە سەردەستی ئەم موسوڵمان بوون؟!!..) پرسیارم لە أبومحمد کرد.. هاواری کرد بەسەرمدا کە بێدەنگ بم ئەگەر ئەمەویٚ بەردەوام بێت لەسەر بەسەرهاتەکەم..

بۆیە خێرا بێدەنگ بووم.. ابو محمد ووتی: منداڵەکە پێی ووتم: پاشان ترسیان هەبوو لەسەرم بۆیە ناردمیان بۆ باشووری ئەفریقیا.. ئەوەتا من نێستا لە باشووری ئەفریقیام.. نیشتەنی زانایان ئەکەم و لەکۆبونەوەکانی بانگخوازاندا ئامادە دەبم لە هەر کویٚ یەك بێت.. و خەڵکی بانگ دەکەم بۆ ئیسلام.. ئەو ئاینە هەقە.. ئاینی فیترەتە.. ئەو ئاینەی پەروەردگارمان فەرمانی پیٚ دەدات کە شوێنی بکەوین..

کۆتاهـەمین ئـایین، ئـەو ئاینـەی عیـسای مەسـیح مـژدەی پێـداوە، کـە پێغەمبـەرێك نـاوی محمـدە ﷺ دوای ئـەو دێـت و لەسـەر هـەموو خـەڵکی جیهان پێویستە کە شوێنی کەون..

..مەسـیحییەکان ئەگـەر بەڕاسـتی شـوێنی مەسـیحیەتی ڕاسـتەقینە بکـەون ئـەوە بەختـەوەری دنیـاو قیامـەت دەبـن.. ئـەوەتا ئـەوە ئـەو ئینجیلـەبوو کـە دەسـتکاری نـەکرابوو کـە لەکتێبخانەکـەی کەنیـسە لـە شیکاغۆ بینیم، بەو شێوە نوسرابوو تیایدا..

خـوای پـەروەردگار ئـەو کتێبـەی نیشاندام، وە لەیەکـەمین لاپـەڕەدا کـە کردمـــەوە، وە یەکـــەمین دێـــڕ کـــە خوێندمـــەوە.. ئەمـــەی تیـــادا نوسرابوو( مەسیح ووتـی بێگومـان پێغەمبـەرێکی عـەرەب دوای مـن دێـت کە ناوی ئەحمەدە).. پەروەردگارا.. چەندە بەبەزەییت.. چەندە مەزنیت، بـەبێ ئـەوەی حیـساب گیری بۆ بکـەم ڕێنوماییـت کـردم.. لەکاتێکـدا مـن کوڕی ئەو قەشەیەم کە مل نادات و دان بەو ڕاستیەدا نانێت! کاك دکتـۆر کاتێـك کـە گـوێم لـەو منداڵـە بچووکە گرتبـوو چـاوانم پڕبـوون لـە ئـاو.. بەڕاســتی موعجیزەیــە.. لــەو تەمەنــە بــچوکەدا، خــوای گــەورە بــە موعجیزەیـەك ڕێنمـایی کـردووە کـە مـن هـەرگیز بـە بیرمـدا نـەدەهات.. هەموو ئەو دووریەی بڕیوە بۆ پارێزگاری لە ئاینەکەی.. بەجوانی گوێم لەبەسـەرهاتەکەی گـرت.. و تەوقـەم کـرد لەگەڵیـدا و ماچـم کـرد، و پـێم ووت خـوای گـەورە بەوویـستی خـۆی خێـر لەسـەر دەسـتی دەنوسـێت.. پاشان منداڵەکە خواحافیزی لێ کردم.. و بە مزگەوتەکەدا دەگەڕا.. ئەو ڕوخسارە پڕ لـە نـوور و ئیمانـەم لـەیاد ناچێت، ڕووخساری ئەو منداڵـە بچووکە.. کە خۆی ناونابوو محمد.. ووتم بە (بو محمد:

بـرای بـەڕێز کـارت تێکـردم.. بەڕاسـتی چـیرۆکێکی سـەیربوو.. وات لێکردم کە بەتاسەوەبم بۆ بینینـی ئـەو منداڵـە بچوکە.. قسەکانم تـەواو نەکرد، گوێم لە دەنگی کارمەندی ناو فڕۆکەکەوە بوو کە هەواڵی داینـیَ لـە شـوێنی خۆمـان دانیـشین، نزیـك بووینەتـەوە لـە فڕۆکەخانـەی (شـارل دیگۆل)ی نێودەوڵەتی لە پاریس..

لە شوێنی خۆم دانیشتم و ئەم ئایەتەم لەبەرخۆمەوە دەوتـەوە ﴿ إنك لا تهدي من أحببت ولكن الله يهدي من يشاء ﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر) تۆ ناتوانی ڕێنمـایی کەسـێك بکـەیت کـە خۆشـت دەویـێت، بـەڵکو خـوای گـەورە ڕێنومـایی هەرکەسـیَ دەکـات کـە خـۆی دەیەویَ.

جارێکیـان گەشـتم کـرد بـۆ باشـوری ئـەفریقیا، وە وێنـەی ئـەو منداڵـە (محمــد) لــە مێــشکمدابوو لــێم جیانــەدەبووەوە، پرســیارم دەکــرد دەربـارەی.. پێیـان دەوتم ئـەو پێـشتر لێرەبـوو وە گەشـتی کـردووە بـۆ شارێکی تر، و خەڵکی بانگ دەکات بۆ لای خوا.. زۆرم حەز دەکرد کە ببینم، وە هەر ڕۆژێك دەبێت -پشت بـەخوا- کـە ببیـنم.. ئەگـەر خـوای گەورە تەمەنمان بداتیَ.. ئایا ئێوەش ئەو حەزەتان تێدایە؟.

# کەڕو لاڵێکی ڕەوانبێژ

ئەمە یەکێکە لە چیرۆکە سەیرو سەمەرەکان، ئەگەر خاوەنەکەی خۆی بە دەستی خۆی نەینوسیبایە بۆم، گومانم دەبرد کە ڕووینەدا بێت. خاوەن چیرۆکەکە خەڵکی شاری مەدینەیە، دەڵێت:

من لاوێکی تەمەن سی و حەوت ساڵانم، ژنم هێناوە، و منداڵم هەیە، هەر شتێك حەرام و قەدەغە بوایە دەمکرد. و نوێژ کردنم ئەنجام نەئەدا، مەگەر تەنها لە بۆنەکاندا ئەویش تەنها بۆ موجامەلەی کەسانی تر، هۆکارەکەیشی ئەوە بوو کە من هاوڕێی یەتی کەسانی خراپ و جادوو بازانم دەکرد، شەیتان لە زۆربەی کاتەکاندا دەست بەردارم نەدەبوو، کوڕێکم هەبوو تەمەنی حەوت ساڵان بوو، ناوی مەروان بوو، کەڕو لاڵ بوو، بەڵام لە ئامێزی دایکیدا پەروەردە کرابوو لە سەر ئیمان..

ڕۆژێکیان من و مەروان لە ماڵەوە بووین، من پلانم دا دەنا کە لە گەڵ هاوڕێکانمدا چی بکەین، و بۆکوێ بڕۆین. کات دوای نوێژی مەغریب بوو، مەروان دەیویست بدوێت لەگەڵمدا (بەو ئاماژانە کە لەیەکتری تێدەگەشتین) ئامارەی بۆ کردم: باوکە بۆچی نوێژ ناکەیت؟! پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، و هەڕەشەی لێکردم کە خوای گەورە دەمبینێت. ئەم کوڕەم هەندێك جار کەکاری خراپم دەکرد دەیبینیم..

سەرم سوڕما لە ئامارەکانی، کوڕەکەم لە بەردەممدا دەستی کرد بە گریان، هەڵم گرت و هێنامە پاڵ خۆمەوە بەڵام ڕایکرد لەدەستم، پاشان ماوەیەکی کەم چووە لای دەست شۆرەکەو دەستنوێژی گرت، پێشتر

دەست نوێژی نەدەزانی بەڵام فێر بوو بوو لە دایکیەوە، ئەو دایکەی کە هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم بەڵام بێهودە بوو، قورئانی پیرۆزی لەبەربوو پاشان منداڵە کەڕو لاڵەکەم هاتەوە بۆ لام، ئامارژەی بۆ کردم کە کەمێك چاوەڕوان بم..

لەبەردەممدا نوێژی کرد، پاشان هەستا قورئانە پیرۆزەکەی هێناو لەبەردەممدا دایناو ڕاستەو خۆ بە بێ ئەوەی لاپەڕەکانی هەڵبداتەوە کردیەوەو پەنجەی خستە سەر ئەم ئایەتە لە سورەتی (المریم)(٤٥) (یا ابت إنی أخاف أن یمسك عژاب من الرحمن فتكون للشیگان ولیا) واتە (ئەی باوکی بەڕێزم، بەڕاستی من دەترسم، لەلایەن خوای میهرەبانەوە سزایەك یەخەت پێ بگرێ ئەوکات ئیتر دەبیتە یارو یاوەرو پشتگیریی شەیتان)

پاشان دەستی کرد بە گریان، منیش لەگەڵیدا گریام، هەستایەوەو فرمێسکەکانی چاومی سڕی، پاشان سەرو دەستی ماچ کردم، پاشان بەو ئامارژەیەی کەلە نێوانماندا هەبوو کە ئەمە ماناکەیەتی ووتی: باوکە گیان نوێژ بکە پێش ئەوەی ئەسپەردەی خاك بکرێیت، سزا چاوەڕوانت بێت..منیش سوێند بە خوای مەزن لەسەر سوڕمان و ترسێکی زۆردا بووم کە تەنها خوای گەورە دەیزانی، بەخێرایی هەستامەوە هەموو کلۆپەکانم داگیرساند، کوڕەکەم ژوور بە ژوور دوام کەوتبوو، بەسەر سوڕمانەوە تەماشای دەکردم، پێی ووتم: واز لە ڕووناکی بێنە، با بڕۆین بۆ مزگەوتی گەورە مەبەستی حەرەمی نەبەوی پیرۆز بوو پێم ووت: با بڕۆین بۆ مزگەوتەکەی نزیکی خۆمان، ڕازی نەبوو تەنها بۆ ئەوێ نەبێ، بۆیە چووین بۆ ئەوێ، وە من زۆر دەترسام، چاوی لێم فەرامۆش نەدەکردو بەردەوام سەرنجی دەدام..چوینە ڕەوزەی پیرۆزەوە، پڕیش

بوو لە خەڵك، هەستاینەوە بۆ نوێژی عیشا، ئیمام ئەم ئایەتانەی لە نوێژەکەدا خوێندەوە (یا أیها الزین ئَمنوا لا تتبعوا خگوات الشیگان، ومن یتبع خگوات الشیگان فإنە یأمر بالفحشاو والمنکر، ولولا فچل الله علیکم ورحمتە مازکی منکم من أحد أبدا ولکن الله یزکی من یشاو، والله سیمع علیم) (النور:٢١)

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاوو نەخشەو پیلانەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەس شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێت زەرەر دەکات چونکە بێکومان ئەو فەرمان بە کردەوەی خراپ و تاوانکاریی دەکات، ئەگەر فەزڵ و میهرەبانیی خوا نەبوایە بەرسەرتانەوە ئەوە هەرگیز کەستانێی پاك و پوختە نەدەبوون، بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێت پاك و پوختەی دەکات و لە گوناهەکانی دەبورێت خوایش هەمیشە بیسەرو زانایە)

ئەم توانی بەهۆی گریانەوە کۆنترۆڵی خۆم بکەم، مەروانیش لەپاڵمدا دەگریا، وەلەکاتی نوێژەکەما مەروان لەگیرفانمدا کلێنسێکی دەرهێناو فرمێسکەکانمی سڕی، وە دوای تەواو بونی نوێژەکە بەردەوام ئەگریام و ئەویش فرمێسکەکانی دەسڕیم، هەتا نزیکی یەك سەعاتی تەواو لە حەرەمی پیرۆزدا دانیشتم..هەتا مەروانی کوڕم پێی ووتم: بەسە باوکە، مەترسە..بەهۆی زۆر گریانمەوە ترسا بوو..گەڕاینەوە بۆماڵەوە..ئەو شەوە لە مەزنترینی شەوەکان بو لەلای من...چونکە لەوشەوەدا تازە لە دایك بوومەوە...خێزانم و منداڵەکانم ئامادە بوون، هەموویان دەستیان کرد بە گریان و نەشیان دەزانی چی ڕوویداوە..مەروان پێی ووتن-بەزمانی ئاماژە- (باوکم لەحەرەمی پیرۆز نوێژی کرد..خێزانم

زۆر دڵشاد بوو بەو هەواڵە، بەڕاستی ئەوە بەرهەمی پەروەردگارە چاکەکەی ئەو بوو..

وە بەسەرهاتەکەی نێوان خۆم و مەروانم بۆ گێڕایەوە، وە پێم ووت: سوێندت ئەیەم بەخوا، ئایا تۆ فێرت کردبوو کە ئەو ئایەتە لەناو قورئانی پیرۆزەکەدایە بکاتەوە؟

سێ جار سوێندی خوارد بە خوا کە ئەو فێری ئەوەی نەکردووە...پاشان خێزانم پێی ووتم: سوپاسی خوا دەکەم لەسەر ڕێنمایی کردنت ئەو شەوە گەشاوەترین شەو بوو، وەمن ئێستا سوپاس بۆ خوا نوێژی جەماعەتم لە مزگەوتا نافەوتێ و وازم لە هەموو هاوڕێی خراپەکانم هێنا، چێژی ئیمانم چەشت.

ئەگەر بتبینیمایە ئەوت لە ڕوخسارمدا دەبینی، وە هەروەها ئێستا لە بەختەوەریەکی زۆرداو خۆشەویستی و گونجان لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا دەژیم، بەتایبەتی کوڕە کەڕو لاڵەکەم -مەروان- کە زۆر خۆشم ئەوێت.

چۆن نا، لەکاتێکدا ڕێنومایکردنی من لە سەر دەستی ئەو بوو.

# یەك گورچیلە

سەعات دەوروبەری چواری بەیانی بوو.. هەمووشتەكانی دەوروبەری كش و مات و بیّ جوولّە بوون تەنها گەلاّی درەختەكان نەبیّت كە شنەی بەرەبەیان دەیجولاّندنەوە، لقی درەختەكە نزیكی پەنجەرەكە بووبوویەوە خەریك بوو باوەشی پیادا دەكرد، هیّمنی و ئارامی هەمووشویّنیّكی گرتبوویەوە، لەپڕ ئاگاداركەرەوەكە جەرەسی لیّدا، ترررن..ترررن..ترررن.. بەپڕتاو خەدیجە ئەو دەنگە ناقۆلاّیەی كپ كرد و لەناوجیّگاكەی هاتە دەرەوە، بەلەش قورسی یەوە بەرەو دەست شۆرەكە ڕۆی.

خەریك بوو ڕادەهات لەگەلّ لەش قورسیەكەیدا، ئەو لەكۆتایی مانگی هەشتەمی سكەكەیدایە، سكی گەورەبووەو قاچی قورس بووە، بەساناترین شت ماندوو دەبوو، تا ئەو ڕادەیەی بەناڕەحەتیش هەناسەی دەدا، دەم و چاوی تیّك چووبوو، ڕوخساری بەهۆی زۆریی گریانەوە تەڕ بووبوون، بەلاّم پیّویستە لەم كاتەدا لەخەو هەستیّت، تەنها سەعاتیّكی ماوە بۆ بانگی بەیانی!!، خەدیجە نزیكترین هاوڕیّم بوو، نزیكەی سیّ سالّ بەسەرشووكردنیدا تیّپەڕی بوو، بیّگومان كاتیّ كە خۆی و میّردەكەی زانیان سكی هەیە زۆر دلّشادبوون، بەلاّم لەیەكیّ لە سەردانەكانیدا بۆ لای پزیشكی پسپۆڕ و دوای ئەنجامدانی پشكنینی پیّویست، پزیشكە ئافرەتەكە هەوالّی پیّدا كە ئەو كچەی لە سكیدایە، تەنها خاوەنی یەك گورچیلەیە!! سبحان الله پزیشكان لیّرە

لـەڕۆژئاوا لەگـەڵ ئـەوەدا کـە پێـشکەوتوون لـەڕووی زانـستەوە بـەڵام هەستی مرۆڤایـەتیان تێدا نیـە، ئەوەتا خەدیجە تووشـی شـۆك هـاتووە لەو هەواڵـەی پزیشکەکە پێـی ووت بەوپـەڕی خـوێن ساردیەوە، ئێستە ئـەو هـیچ چارەیەکی کـت و پـڕی لـەلا نیـە بـەڵام دوای منـداڵ بوونەکـە دەتـوانرێ چـەندین پـشکنین لەسـەر منداڵەکـە بکرێـت تـاوەکو ڕادەی تەندروستی یـەك گورچیلەکە بزانرێت، ئەگـەر تەندروستی گورچیلەکە باش نـەبوو ئـەوە نەشـتەرگەری چاندنی گورچیلە وەکـو نەشـتەرگەری لۆزەتێنی لێهاتووە!! خەدیجە لـەلای پزیـشکەکە هاتـە دەرەوەو ئاگـای لەخۆی نەمابوو.. نەی زانی چۆن گەشتووەتە ماڵی خۆیان!!

یەکەمین منداڵیـەتی و یـەك گورچیلەشـی هەیـە چارە چی یـە؟ تۆ بڵێـی پزیـشکەکە لـە پـشکنینەکەیدا هەڵـەی کردبێـت؟ خەدیجـە و مێردەکـەی گـەڕان بـەدوای باشـترین پزشـك لـەو بـوارەدا، بـەڵام هـەموو پزیـشکەکان هـەمان قسەیان کـرد.. یـەك گورچیلە!! وە لەگـەڵ هـەموو سـەردانێکیدا بۆلای پزیـشك هیـواو ئومێـدی کـەمتر دەبوویـەوە، لەکۆتاییـدا تەسلیمی ئـەمری واقیـع بـوو، وە کۆتاهـەمین پزیـشك پێـی ووت کـە خـۆی ماندوونەکات و باروودۆخەکە هیچ ناگۆڕێت.

خەدیجـە لەوسـاتەدا هەسـتی بـەوە دەکـرد کـە هـیچ لەدەسـەڵاتی ئەمدا نییە تەنها ڕووکردنە خوای پەروەردگار نەبێت بەدوعاکردن، لـەو ڕۆژەوە بڕیاریدا سێ یـەکی کۆتـایی شـەو زیندووبکاتـەوەو هەستێت بۆ نوێژ و دوعاکردن بۆ کچەکەی کە هێشتا لە دایك نەبووە.

پـەروەردگار لـەقورئانی پـیرۆزدا دەفـەرموێ: (أجیـب الـدعوە الـداع إذا دعان، فلیستجیبوا لی و لیؤمنوا بی لعلهم یرشدون) البقرە:١٨٦

واتە: (ئەی محەمەدﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بەهانای ئەوانەوە دەچم کە تکاکارمن، دەبا ئەوانیش بەدەم منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بەمن بهێنن بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنە بەر.

(إن يمسسك الله بچرٍ فلا كاشف له إلاّ هو، وإن يمسسك بخير فهو على كل شئ قدير) الانعام:١٧

(دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دووچاری زیان و گرفتێکی بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە لەخۆی نەبێت، وەئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیە.

(وإن يمسسك الله بچر فلا كاشف له إلا هو، وإن يردك بخير فلا رادّ لفچله، يصيب به من يشا و من عبادە، وهوالغفور الرحيم) يونس:١٠٧.

واتە: (ئەی ئینسان) ئەگەر خوا تووشی زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە کەس ناتووانێ لایبەرێت جگە لەخۆی نەبێت، وە ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەرکام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات، ئەو زاتە هەمیشە لێبوردەو میهرەبانە.

(وقال ربكم ادعوني استجب لكم، إن الڕين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين) غافر:٦٠

واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆ من بهێنن ئەوە من وەڵامتان دەدەمەوە، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن و لووت بەرزیی دەکەن لە ئاستی پەرستنی مندا، لە ئایندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتیەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە هەروەها لەفەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ینزل ربنا تبارك وتعلى كل ليله إلى سما و الدنيا، حين يبقى پلپ الليل، فيقول: من يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعگيه، من يستغفرني فاغفر له) رواه البخاری (١١٤٥)، مسلم (١٧٧٢).

واتە: خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیا، کاتێ کە سێ یەکی کۆتاهەمی شەومابێت و دەفەرموێ: کێ داواکاری هەیە لە من باوەڵامی بدەمەوە، کێ شتم لێ داوادەکات با بیدەمێ، وە کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات با لێی خۆش ببم.

خەدیجە دڵنیابوو کە پشت و پەنا تەنها پەروەردگارە، بۆیە بەیانیەك نەبوو کە سەعاتێك پێش بانگی بەیانی هەڵنەسێت یان زووتر هەرچەندە بەهۆی کەم خەوتن و سکەکەشیوە زۆر ماندوو بوو.

ڕۆژانە لەسێ یەکی کۆتایی شەودا دەچووە سەر بەرماڵەکەی بۆ نوێژکردن و سوجدەبردن بەخشوعەوە (بەملکەچییەوە) وە دەپاڕایەوە لەخوای پەروەردگار کە کچەکەیی پێ ببەخشێت بەتەندروستیەکی باش و بەدوو گورچیلەوە! لەسەر دووعاو پاڕانەوەکانی سوربوو وە دەگریا بەڕادەیەك کە بەرماڵەکەی تەڕ دەکرد، ڕۆژێك نەبوو ماندوو بێتاقەت بێت، هەرچەندە جەستەشی ماندوو بوو، ڕکوع و سجود بۆ ئەو زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام کۆڵی نەدەدا و بێزاری دەرنەدەبڕی بابۆیەك جاریش بێت، هەرکاتێ پزیشکەکە هەمان ئەنجامی پێ دەوت و لەهەموو سەردانەکاندا لەگەڵ هەموو پشکنینێکدا ئەم زیاتر سوربوو لەسەر شەوهەستانەکەی لەسێ یەکی کۆتایی شەودا.

مێردەکـەی بـەزەیی پیـادا دەهاتـەوە بـەهۆی زۆر هەسـتانی وەترسـی هەبوو مندالّ بوونەکە بەباشی نەکەوێتەوە، وە هەمیشە بیری ژنەکـەیی دەخستەوە کە پەروەردگار هەندێ جار وەلامدانـەوەی دوعا دوادەخات، لەئەبوسەعیدەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: (ما من مسلم يدعو بدعوة ليس فيها إثم و قطيعة رحم إلاّ عطاه الله بها إحدى ثلاث: إما أن تعجل له دعوته، وإما أن يدخرها له في الآخرة، وإما أن يصرف عنه من السوء مثلها قالوا إذانكثر قال الله أكثر) الترمذي: ٣٦٠٤.

واتە: هەر موسوڵمانێ لەدوعاکانیدا داوا لەپەروەردگار بکات بەمەرجێ داواکاریەکـەی بـۆ گوناهکـاریی یـان بـچڕانی سـیلەی ڕەحـم نـەبێت بێگومـان پـەروەردگار یـەکێ لـەم سـیانەی پـێ دەبەخـشێ: یـان داواکاریەکەی پێش دەخات و بۆی ئەنجام دەدات، یان هەڵیدەگرێ بۆ قیامـەت و لـەوێ پاداشـتی دەداتـەوە، یـان بەئەنـدازەی ئـەوە لـە زیـان دووری دەخاتـەوە، ووتیـان: ئـەی ئەگـەر داواکاریـەکانمان زۆربێـت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە زۆرتری لەلایە.

ئـەویش بـەبیری مێردەکـەیی هێنایەوە کـە چارە نیـە تـەنها داواکردنـی کۆمەك نەبێت لەپـەروەردگار، ئەگـەر داوای کۆمـەك لەپـەروەردگار نـەکات ئەی داوای کۆمەك لە کێ بکات؟؟!!

لا تسألن بني آدم حاجة

وسل الذي أبوابه لا تحجب

الله يغضب إن تركت سؤاله

وبني آدم حين يسأل يغضب

واتە: داوای پێویستی لە بەنی ئادەم (مرۆڤ) مەکە

داوا لەو زاتە بکە کە دەرگاکانی داناخرێت
پەروەردگار توڕەدەبێت ئەگەر داوای کۆمەکی لێ نەکەی
وە بەنی ئادەم توڕە دەبێت گەر داوای کۆمەکی لێ بکەیت.

چـــۆن داوای کۆمـــەکی لێ ناکـــات لەکاتێکـــدا پێغەمبـــەر ﷺ لـــە فەرموودەیەکی قودسیدا لەسەر زاری پەروەردگار دەفەرموێ: (یا عبادي لو ان أولكم وآخركم وإنسكم و جنّكم قاموا في صعيد واحد فسألوني، فاعطيت كل إنسان مسألته، وما نقص ذلك مما عندي إلاّ كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر. رواه مسلم/٦٥٧٢

(ئەی بەندەکانم ئەگەر لەیەکەمین کەستانەوە تا دواهەمینتان بە مرۆڤ و پەریـەوە، لەیـەك زەوی پـان و بەریـنـدا کۆببنـەوەو دوعـاو داواکاریتـان هـەبێت، داواکـاریی هـەموو مرۆڤـەکان ئـەنجام دەدەم، ئەمـەش هـیچ لـە ڕۆزی و نیعمـەتی مـن کـەم ناکاتـەوە وەك چـۆن دەرهێنـانی پـەتێك لەدەریایەکدا لە ئاوی دەریاکە کەم ناکاتەوە).

وە پێش کاتی منداڵ بوونەکە بە نزیکەی دووهەفتە خەدیجە هات بۆ سـەردانم، کـاتی نوێـژی نیـوەڕۆ هـات و نوێـژمان کـرد و پـێش ئـەوەی هەستین خەدیجە دەستی درێژ کرد و باڵی گرتتم و هـەواڵی دامـێ کە هەست بە شتێکی سەیر دەکات، پرسیارم لێ‌کرد ئایا هەست بە هیچ ئـازارێ ئـەکات، بەنـەخێر وەڵامـی دایـەوە، بـەڵام بۆزیـاتر دڵنیـابوون بڕیارمانـدا پەیوەنـدی بـە پزیـشکەکەیەوە بکـەین، داوای لێکـردین لـە نەخۆشخانە بیبینین، هەواڵماندا پەیوەندی بە مێردی خەدیجـەوە بکـەین بـەڵام بـێ سـوود بـوو، چـونکە لـە نوێـژی هـەینی بـوو، پـشتمان بـە خـوا بەست و چووین بۆ نەخۆشخانە، سەرمان سوڕما کـە هـەواڵیان پـێ داین لـەکاتی خۆیـدا ڕۆیـشتووین، واتـە کـاتی منـداڵ بوونەکەیـەتی!! لەپاڵیـدا

خێزانەکەت و ئەوانەی خۆشت دەوێن بەسەر بەریت.. بەڵام وەڵامەکەی بۆ من و بۆ هەموو کچەکانی تر کە لەگەڵماندا بوون لەکاتی پێشوازی کردن لێی مەزنترین کاریگەریی هەبوو لەسەر دەروونی هەمووان..
ئێمەش ستایشی ئەو ئیمان و متمانەبوونەیمان کرد کە بۆ پەروەردگار هەیبوو.. پێی ووتین: بەهۆی خوێندنی لەکۆلێژی پزیشکی پەیوەندی ئەم و پەروەردگاری تازە بووەتەوە.. وە هەر خوای گەورە دەزانێ کە ئارەزووی و ڕۆژانی خوێندنی هەر هەمووی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان.. تاخزمەتی نەتەوەکەی بکات کە ئێستاو هەتا دواهەمین ڕۆژی ئەم ژیانە باشترین نەتەوەیە کە هەڵێنجرابن بۆ خەڵکی لەڕووی ئاین و زانست و ئاکارەوە.

ئاواتم دەخواست ڕۆژێ لە ڕۆژان وەك ئەو پزیشکە موسڵمانە وابم کە لە خوا دەترسێ وە هەموو زانست و توانای تەرخان کردووە بۆ موسڵمانان.. کاتێ گەشتە ئەو ئاستە لە زانستا تووشی ئەو نەخۆشیە هات.. لەلایەکی ترەوە تکاکاربوو لەخوا کەتەمەنی درێژ بکات، تا لەو کەسانەبێت کە بگەڕێت بەدوای ماکی ئەو نەخۆشیەداو توێژینەوە بۆ چارەسەرکردنی.. بەڵام تەمەن و ڕۆژەکان بەدەست خوای گەورەیە.. سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەو هەمووشتە.. کەس تاقی ناکرێتەوە بێجگە لە ئیمانداران.

ئەوەی بەسەر ئەودا هاتووە هیچ نیە بەبەراورد لەگەڵ ئەوەدا کە بەسەر پێغەمبەری خوادا هات.. موسڵمانانی پێشەنگ ڕاهاتوون و ئەوان چەندین جار لە ئێمە زیاتر بارگرانیان هەڵگرتبوو..؟

مانای چیە توشی نەخۆشی بوو، ئایا مانای ئەوەیە کە لەکارکردن بوەستێت لەم ژیانەدا.. باشتر ئەوەبوو بەردەوام بێت لەسەر کارێ کە

دەستی پێکردبوو.. لەگەڵ ناڕەحەتی و بیماریی نەخۆشیەکەیدا بەڵام دەیزانی کە خوای گەورە هیچ شتێك زایەو وون ناکات.. ئەمانە قسەی ئەو بوون.. ڕەحمەتی خوای لێبێت و شادی بکات بەبەهەشتی بەرین.. کاتێ دەیەویست بەرەو زانکۆ بڕوات وەفاتی کرد، بڕوات بۆ زانکۆ تا بەردەوام بێت لەسەر خوێندن.. لاشەکەیان ناردەوە بۆ ئەو وولاتەی کە نیشتەجێ بوو تیایدا. هەمووان هەستیانکرد کە زانایەك و پزیشکێکی موسڵمانی ئافرەتیان لەدەست داوە.. ئەم کەس و کاری جێ هێشتبوو لەپێناو وەرگرتنی زانستدا..وەکاتێك بەرەو مینبەرەکانی زانست هەنگاوی دەنا وەفاتی کرد..

بەڕاستی مردنی و جوامێری و بەرەنگاربوونەوەی بۆ نەخۆشیەکە لەدڵمدا مەزنترین شوێنەواریان جێ هێشت.. بەڕاستی لەمردنیدا هەست بە ژیان دەکرا بۆ من و هەموو ئەوانەی کە دەیانناسی... خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات...

# کچەکەمم لەدەستدا

بەسەرهاتی من بەسەرهاتی باوکێکە کە فرمێسکی حەسرەت و پەشیمانی دەڕژێت، دوای ئەو خەوەی کە بینیم دەربارەی کچە گەنجەکەم کە پێش ماوەیەکی کەم وەفاتی کرد لە ئەنجامی نەخۆشیەکی ئازاراویدا.. کچەکەمم بینی تەماشام دەکات و دەڵێت(حسبی الله و نعم الوکیل)..

بەردەوام ئەوەی دەوتەوە... سوربوومەوە و زۆر بەتاسەوە لێم پرسی: دەتەوێ تۆڵە لەکێ بکەیتەوە تامن تۆڵەی لێ بکەمەوە؟

وتی: لەتۆ باوکە.. ئەی ئەوکەسەی زیادەڕەویت کرد تیامداو، نەتپاراستم، ئەی ئەوکەسەی ناپاکیت کرد لەو ڕاسپاردەیە.. تۆ هاوکار بوی لەوەی کە من ئێستا تیایدام.. (حسبی الله علیك) سەرسام بووم بەوەو بە ئەبڵەقیەوە پرسیم: ئەی تۆ ئێستە لە کوێی؟

لەوەڵامدا وتی: ئایا ئەزانی من لە کوێم؟ لەوکاتەدا ڕوخساری پاراوی و گەشاوەییەکەی گۆڕا بۆ ڕوخسارێکی ترسناك و ناشرین.. وە چاوەکانی وەکو دوو چڵۆسکیان لێ هاتبوو کە ئاگر بپژێنن، وتی:من ئێستا لە چاڵێکدام لە چاڵەکانی دۆزەخ، پێم ووت :بۆچی؟بۆچی وات لێ بەسەرهات؟

وتی: تۆ هۆکاربوویت.. تۆ من و خوشك و براکانمت دەبینی دادەنیشتین بەدیار فیلمە بێ بەهاکانی شەوەوە و ڕێگات لێ

نەدەگرتین، وە کاتی نوێژی بەیانی دەخەوتین، هەوڵت نەدەدا خەبەرمانکەیتەوە، بەڵکو دەتبردین بۆ ئەو دوکانانەی کاسێتی ڤیدیۆ دەدەن بە کرێ.. فرۆشیارەکە ورتانێکی ئاراستە دەکردین کە جەستە پارچە پارچە دەبێت لەشەرماندا، ئێمەگرنگیمان دەدابەوە.. بەڵکو پێدەکەنین.. دەچوین بۆ بازاڕ خۆمان دەڕازاندەوەو بۆنمان لەخۆمان دەدا بەبێ ئەوەی مەحرەممان لەگەڵدا بێت تاسەرنجی کوڕان ڕابکێشین، بەبێ چاودێری یان گرنگی پێدانی تۆ، تۆ بوونت نەبوو.. لەوکاتەدا لەخەوەکەم ڕاچڵەکیم و بەترسەوە بەئاگا هاتم.. بڕوام پێبکەن..

لەگەڵ پەرێشانیم بۆ ئایندەی کچەکەم.. ئاواتیشم دەخواست بەخەبەر نەهاتمایە تاکچەکەم قسەکانی تەواو دەکات، چونکە من دەمویست ئەو هەڵانە ڕاست بکەمەوە کە لەگەڵ کچەکەمدا ئەنجامم دابوو تا کچەکانی تریشم وایان بەسەر نەیەت، وە پەروەردەیان بکەم لەسەر پەروەردەیەکی دروستی ئیسلامیانە.. وە ئێستا داوا لە هەموو ئەوانە دەکەم کە ئەم بەسەرهاتە ناخۆشەی من دەخوێننەوە دەستەکانیان بەرز بکەنەوە بۆ ئاسمان و داوا لە خوای گەورە بکەن کە لە کچەکەم خۆش ببێت کە پاش خوای گەورە بوو بەهۆی ڕێنمایی کردنی من.

# ڕێنمایی

دەمەوێ خۆمتان پێ بناسێنم، من کچێکم لەناو خێزانێکی بەڕێزدا گەورەبووم، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بە ئاینەوە نەبوو.. دایکم باڵاپۆش نەبوو، وە نەمدەبینی باوکم و دایکم نوێژ بکەن..

هەموو ئەوەی کەمن دەمزانی من موسڵمانم و لەقوتابخانەیەکی فەرەنسیدا لای((ڕاهیبەکان)) پەروەردە بووم.. هەموو خەمی من پۆشاك و یانەو هاوڕێ و ئاهەنگ بوو.. هەموو جۆرە جلێکی ناپۆشتەم لەبەر دەکرد.. وەوا تەماشای باڵاپۆشەکانم دەکرد کە دواکەوتوو و کۆنەپەرستن.. دەموت ئایا قژو هەردوو دەست و پێ جێگەی سەرنج و وروژاندنن؟ تا ئەوکاتەی خوشکە گەورەکەم شوی کرد بە هاوڕێیەکی خۆی کە کەمێك دیندار بوو.. هانی خوشکەکەمی دەدا کە نوێژ بکات و قورئان بخوێنێت، خوشکەکەم حیجابی پۆشی.. بەزۆر شێوە بانگەوازی منیشی دەکرد، بەڵام هەموو هەوڵەکانی توشی شکست دەبوون.. خوشکەکەم لەپێناوی مندا دەگریا.. دایکیشم هانی منی دەداو لە خوشکەکەم تووڕە دەبوو.. لەمانگی ڕەمەزاندا خوشکەکەم دەچوو بۆ نوێژی تەراویح لە مزگەوت.. ڕۆژێکیان لەگەڵیدا ڕۆیشتم، بۆ نوێژ کردن نا، بەڵکو تەنها بۆ چوونە دەرەوە و گەڕان.. کاتێ چوومە مزگەوتەوە ترسێك هات بە جەستەمدا.. شوێنەکە بە نیسبەت منەوە نامۆ بوو.. ئافرەتان قورئانیان دەخوێندو دەگریان.. کۆمەڵێکی تریش بەملکەچیەوە نوێژیان دەکرد.. کۆمەڵێکی تریش لەناو مزگەوتا

خوێنیـان دەبەخـشی.. ئیمـام نوێـژی دابەسـت.. بـەهۆی بیرکردنـەوەوە تەرکیزم لەسەر هیچ ووشەیەك نەبوو..

دوای تـەواوبوونی نوێژ ئیمام دانیشت کە لـە شێخە ناسراوەکان بـوو باسـی ژیـانی پێغەمبـەر (ﷺ) و خێزانـەکانی دەکـرد.. حـەزم لــەو بەسەرهاتە بوو.. بۆ ڕۆژی دوایی چوومەوە تاگوێم لە تەواوی باسەکەوە بێت.. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ئاشنا دەبووم بە ئیسلام.. هەوڵمدا قورئان بخوێنمەوە، بەڵام بۆ من سەخت بوو.. نارەحەت بوو کە لێی تێبگەم، نەمدەزانی بیخوێنمـەوە.. داوایەکی زۆرم لـە خـوای گـەورە کـرد تـاوەکو مێردێـك بکـات بـە نـسیبم وەك مێـردی خوشـکەکەم تـاوەکو ڕێنومـاییم بکات بۆلای خوا...

گەڕامەوە بۆ ماڵ، لە ماڵەوە کۆنە هاوڕێیەکی دایکمم بینـی کـە هـاوڕێی قوتابخانـە بـوون ... هـەردووکیان زیـاتر لـە (٣٠) سـاڵ دەبوو دابڕابوون لەیـەکتر، بەڕێکـەوت دایکمـی بینـی بـوو، بۆیـە هـاتبوو بـۆ دیـدەنی و کوڕێکی خۆیی لەگەڵدا بوو کـە تەمـەنی (٢٦) سـاڵ بـوو.. کـوڕێکی ڕۆح سوك و بە شەخصیەت بوو... دەرچوی زانکۆ بـوو.. لـەوڵاتێکی عـەرەبی فەرمانبـەر بـوو بـە بڕێـك پـارەی بـاش، لـەماوەی هەفتەیەکـدا دەبـوو سەفەری بکردایە... من جێ سـەرنجی بووم ..بۆیـە داوای کـردم.. بـەڵام دانمـان پیـادا نـەنا، بـەهۆی بچوکی منـەوە.. لەدواناوەنـدی گـشتیدا بـە پلەی زۆر باشە دەرچووم و پەیوەندیم کرد بـە کۆلێـژی گەشـت و گـوزارو ئوتێلەکانەوە کە بەدرێژایی ژیانم خەوم پێوە دەبینی.. پـلانم بۆ دانـابوو کە بەتەنها وڵاتانێکی زۆر بگـەڕێم، ئاشـنابیم بـە کۆمپانیاکـانی گەشـت و گـوزار، و ئۆتۆمبێـل و پـارەو شـتی زۆر، بـەڵام ئـەو لاوە گەڕایـەوەو سـور

بوو لەسەر ئەوەی من بخوازێت، هەرچەندە کەس و کارم دانیان پیادانەدەنا بەبیانوی تەواو نەکردنی خوێندنەکەمەوە.

نامەویٚ درێژەی بەمیٚ.. شووم پێکرد و لەگەڵیدا ڕۆشتم بۆ (جدّة) دوای هەفتەیەك (عەمرە)م ئەنجامدا.. وە دوای سیٚ مانگ حەجیشم کرد، بۆیە بالاٚم پۆشی و پابەند بووم بە ئاکاری ئیسلامییەوەو نزیك بوومەوە لەخوای گەورە.. دوومانگ جارێك دەچووم بۆ شاری مەدینە، هەموو ڕۆژیٚ نوێژی مەغریب و عیشام لە مزگەوتا دەکرد.. شریتی قورئانم دەست خست و فێری خوێندنەوەی قورئان بووم و چوار جزمم لەبەر کرد، دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەرو فەرموودەکان و فیقه و خەلیفەکان کتێبی زۆرم کڕی و شوێن پێیانم هەڵدەگرت، من ئێستا تەمەنم (٢٦) ساڵەو سوپاس بۆ خوا بالاٚپۆشم و میکیاج ناکەم و ڕەنگی والاٚ لەبەر ناکەم، ڕۆژانە ئەمڕۆم لە دوێنیٚ باشترە.. بوومەتە بانگخواز لەناو کەس و کارمدا، لەبارەی ئاینەوە ڕاوێژم پێدەکەن.. تا ئێستا نازانم ئەم زەواجەی من چۆن تەواو بوو وە چۆن هاوڕێیەکی دایکم دوای تێپەڕ بوونی ساڵانێکی درێژ دەرکەوت چۆن ڕازی بووم شوبکەم بەو شێوازە کلاسیکیە بە پیاوێك کە هیچ دەربارەی نازانم ..چۆن بەو ئاسانیە وازمهێنا لەخوێندەکەم کە ئاواتم بوو.. لە پێناوی پیاوێکدا کە نەمدەناسی.. چۆن ڕازی بووم زەواجم تەواو بێت لە میانی سیٚ مانگدا.. چۆن ڕازی بووم سەفەر بکەم بۆ وولاٚتێکی غەریبی کە کەسی تیادا ناناسم، لەگەڵ پیاوێکدا کە نایناسم.. بەلاٚم لەکۆتاییدا دەڵێم: خوای گەورە ویستی چاوم ببەستێت لەو شتانە،وەکارم بۆ ئاسانکات تا ڕزگارم بکات لەو ڕێگایەدا کەمن دەمویست پیایدا بڕۆم ،وە بمخاتە سەر ڕاستە شەقام (الطريق المستقيم).

سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێنومایی کردین بۆ ئەمە، وە ئێمە ڕێنرمایی نەدەکراین، ئەگەر ئەو زاتە ڕێنومایی نەکردینایە وە من شایەتی دەدەم بە خراو بە هەڵگرانی عەرشی و بەفریشتەکانی و بە پێغەمبەرەکەی و بە هەموو دروستکراوەکانی و ئێوە دەگرم بە شایەت کە من گەڕاومەتەوە بۆ لای خواو تەوبەم کردووەو خۆم بەری دەکەم لەوەی کە کردوومەو پەشیمانم، وە دەخوازم لە خوا کە لەمن و ئێوە خۆش بێت و لە قیامەتدا پێکەوە کۆمان بکاتەوە..

# ڕۆزیـــی خــوا

بەسەرهاتی ڕێنماییم لە مانگێکدا تەواو بوو.. بەڵام سەختترین مانگ بوو کەبەسەرمدا ڕابورد.. ئەگەر فەزڵی خوای پەروەردگار نەبوایە ئێستا ئابەم شێوەیە نەدەبووم.. سکم هەبوو، لەمانگی هەشتەمدا بووم، ئای چەندە چاوەڕوانیم کردو ساڵانێکی درێژ چارەسەرم بەکار دەهێنا، ویستی خوای گەورە وابوو کە حاڵەتی تەندروستیم بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەو لاوازیی دەچوو.. پزیشکە گەورەکان دەستەوسان بووبوون لەچارەسەرکردنی من و کۆرپەکەم، چونکە ئەستەم بوو من و کۆرپەکەشم پێکەوە ڕزگارمان ببێت.. بەڵکو زۆر بەڕاشکاوانە بۆ ئەو کۆرپەیەی کە چاوەڕوانم دەکرد سوجدەی شوکرم نەبرد و هیچ نوێژێکم نەکرد کە پەروەردگارم ئەم ڕۆزیەی پێ بەخشیوم دوای گرتنەبەری چەندین چارەسەری قورس.. بەشێوەیەکی بەرچاو حاڵەتم بەرەو لاوازیی دەچوو.. گەشەی سروشتی منداڵەکە وەستابوو، لە ئەنجامی هۆکارانێك کە لەتوانای مرۆڤ بەدەر بوو.. لێرەدا هەڵوێستەیەکم کردو دڵنیابووم کە خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ کەس لەم گەردوونەدا ناتوانێت سودێکت پێ بگەیەنێ یان زیانێکت پێ بگەیەنێ ئەگەر لای خوای گەورە لەچارەت نەنوسرابێ.. ئای چەندە لاوازبووم.. هیچم پێ نەدەکرا نە من و نە پزیشکەکان، ئەوانیش دەستەوسان بوون لە پێشکەشکردنی یارمەتی تەواودا..

ئەی ئادەمیزاد ئای کە چەندە لاوازیت!! ئای کەچەند پێویستت بە پەروەردگارت هەیە!! چەندە لە لوتکەی لاوازیدایت لەکاتی کۆست و ناڕەحەتیدا.

بەڵام دنیای فانی لەخۆبایی کردبووین، من بەبەرچاومەوە خەونەکەی خۆم دەبینم رۆژ لە دوای رۆژ لەدەست دەچێت، بۆیە پەنام برد بۆ ئەو خوا تاك و تەنهایەی لەکاتی ناڕەحەتیدا پشتی پێ دەبەستین ..ئای کە چەندە پەروەردگارێکی بەخشندە بوو بەرامبەرم.

چەندە میهرەبان بوو بەرامبەرم.. بەخوا خوشکان و برایانم حەز دەکەم وێنای حاڵەتی دەروونیم بکەن لەو کاتەدا، بەڵام لەگەڵ زیکرو قورئان و نوێژ و دوعاو لەگەڵ دڵنیاییم کە خوای گەورە وەڵامم دەداتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە من شایانی ئەوە نەبووم چونکە لەکاتی خۆشی و تەندروستیدا یادم نەدەکردەوە.. بەڵام یادم کردەوەو من پێویستیم بەڕەحم و بەزەیی ئەو زاتە بوو، کەواتە لە زاتێکی پیرۆزو لێبوردەو ڕۆزیدەرو شیفابەخش و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی چاوەڕوانی چی دەکرێت.. بێگومان دڵئارامی و حەوانەوەی پێبەخشیم هەرچەندە ئەو واقیعەی منی تیادا دەژیام هیچ مژدەیەکی خێری تیادا نەبوو بۆ من..من لێرەدا هەڵوێستەیەکم هەیە کە دەخوازم پەندی لێ وەربگیرێت، ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە بەتوانایە وات لێ بکات و زۆرت لێ بکات کە بیپەرستی و یادی بکەیت.. هەمیشە لەیادت بێت کە خوای گەورە توانادارە بەسەر هەموو شتەکاندا.. بێگومان ئێمەی دروستکردووە تاوەکو بیپەرستین و سوپاسی بکەین لەسەر ئەو هەموو ڕۆزیە کە پێی بەخشیوین.. ئەگەر ئەو ڕۆزیانە نەبوایە بۆ ئەم ژیانە نەدەشایت.. دەی کەواتە بیپەرستەو نوێژی بۆ بکەو بزانە کە تۆ بەبێ خوا ژیانت خۆش

نابێت، نە بەسەروەت و سامانیش، چونکە سەروەت و سامانت و دنیا دووشتن تەواو دەبن، با پشتیوان (رصید)ێکت هەبێت تەواو نەبێت.. توێشوی زۆر بخەن چونکە سەفەرەکە درێژەو ڕۆژی دوایی خێردارترەو نەبڕاوەیە.

بەکەرتی ویستی خوا وابوو منداڵەکەم ببێت لە مانگی هەشتەمدا، بێتە سۆمای چاوم و بە وویستی خوای گەورە لە مردنێکی چاوەڕوانکراو ڕزگاری ببێت.. خرایە نەخۆشخانەوە بۆ چەند ڕۆژێکی دیاریکراو تاوەکو حاڵەتی تەندروستی جێگیر ببێت.. سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەو هەموو بارانە.. ناومنا (مەریەم) چونکە بەزۆریی لەکاتی سکەکەمدا ئەو سورەتەم دەخوێندەوە، وە دەپاڕامەوە لە پەروەردگار ڕزگاریکات بۆم و چاوانم بەدیدەنی شاد بێت، ئای کە چەندە دەپاڕامەوە کە خوای گەورە بیپارێزێ لە هەموو ناڕەحەتیەك.. بڕیارمدابوو کە ناوی بنێم (مەریەم) بەهۆی منەتباریی ئەو سورەتە پیرۆزەوە، ئێستا کەدەیخوێنمەوە بەکوڵ گریانم دێت، دێتەوەیادم کە خوای گەورە بەخشندەیەکی بێ سنورە.. وە هیچ دەروازەیەك نیە بێجگە لەگەڕانەوە بۆلای خوا.. ڕێنومایی کرام و زانیم کە خوای گەورە بێ نیازەو ئەو زاتەیە لەکاتی ناڕەحەتیدا پشتی پێ دەبەسترێت، ناتوانین دەستبەرداری ببین.. دەپاڕێمەوە لەخوا کە ڕەحمم پێ بکات و لێم خۆشبێت و ڕێگام و دڵم ڕوناك کاتەوە بە نوری ئیمان و پەرستنی ڕەحمان.. ئەو باشترین کۆمەك و سەرخەرە.. وە داوا لە خوای گەورە دەکەم کە ڕۆزیی عەمرەم پێ ببەخشێ و چاوم ڕوناك بێتەوە بە بینینی مەککەی پیرۆز، وە بتوانم نوێژ لە پیرۆزترین خاکی ئەم زەمینەدا بکەم...

# بەرەبەیان

ئەوەتا ڕووناکی بەرەبەیان هەڵدێت و ئەوەش دەنگی کچە بچوکەکەمە، هەستامەوە بەدەمیەوەو شیرم پێدا شیری خواردو بەئارامیەوە خەوتەوە.. هێشتا نوێژی بەیانیم نەکردبوو.. بەلام بێئاگابووم لە نوێژەکە وام بینی وەك چۆن کەسێك خەو دەبینیێ من بەتەنها دەڕۆم و بەدوای کچەکەمدا وێڵم.. ئەوە لەکوێیە؟ ئەگەرێم بەدوایداو نایبینمەوە ...لەخەوەکەم بە ئاگا هاتمەوە، لە نزیکمەوە بوو، دوو سەعات تێپەڕی کردبوو بەسەریدا پلەی گەرمایی بەرز بووبوویەوە..!!

بۆچی وا؟ بەبێ پێشەکی بەبێ هۆ، چی لێهاتبێت؟ بۆچی ئەم نەخۆش کەوت.. کولمەکانی لەڕەنگی سوری ئاڵەوە گۆڕا بوون بۆ زەردێکی نەخۆشاوی.. پزیشك پێی ووتم: تەندروستی باشەو پێویستی بەهەندێ پشکنینە.. کۆمەڵێ پشکنینم بۆ ئەنجامدا.. هەموویان دەریاندەخست کە نەخۆشە، بەلام نەخۆشیەکی سەخت نیە.. داوام لە خوای گەورە کرد شیفای بدات و بەدوری بگرێت لە نەخۆشی.. بەلام بە چ ڕوویەك بچمە بەردەم بارەگای خوا.. چۆن داوای کۆمەکی لێ بکەم کە لەش ساغی بکات چونکە بەهۆی منداڵەکەمەوە بێئاگابووم لە نوێژی بەیانی، بەڵێ لەیادمە پێش لەدایك بوونی ئەم منداڵە هەرگیز نوێژی بەیانیم نەفەوتاوە.. بێگومان منداڵەکەم هۆکارە.. نا نەخێر ئەو نیە، من شەونخونی دەکێشم تا درەنگانێ تا دواهەمین ژەمی بەمێ و پاشان دەنووم و بەو شێوەیە نوێژی بەیانیم دەفەوتێ.. نوێژەکەم پەیوەست

کرد بە نەخۆشی منداڵەکەمەوە، لەوانەیە خوای گەورە بیەوێت سزام بدات بەهۆی وازهێنانم لە نوێژی بەیانی، هەوڵمدا کاتەکانم ڕێك بخەم و هەستم بۆ نوێژی بەیانی.. یەکەم ڕۆژ و دووەم ڕۆژ هەستام.. دوو ڕۆژ دواکەوتم.. دوای ئەوە خۆم ڕێکخستەوەو منداڵەکەم بردەوە بۆلای پزیشك.. هەموو پشکنین و شیکارەکانم بۆ ئەنجامداو پزیشکەکە پێی وتم دنداڵەکەت سەلامەتەو هیچی نییە، وەك ئەوەی پشکنین و شیکارییەکانی پێشوو هەڵە بووبن.

داوای لێبوردنم لە خوای گەورە کرد و دەستم کرد بە دوعای خێر و ئیتر لەو ڕۆژەوە بێئاگا نەدەبووم لە نوێژەکانم.

# ئەو مردنە چەند جوانە

لاوێـك بـوو وەك هـەموو لاوەكـانی تـر، لەیـەكیٚ لـەلادێكانی كوردسـتان لەدایك بوو بوو.. پاشان لەگەڵ باوكیدا سـەفەری كردبوو بۆ دیمەشـق.. لـە دیمەشـق گـەورە بـوو بـوو.. لـە ژێـر دەسـتی ژمارەیـەك زانـای ئـەویٚ گەورە بوو بوو.. تاوەكو علوم شـەرعی تـەواو كـرد لەتەمـەنی ٢٠ سـاڵیدا بـوو. توشـی لـەخۆبایی بـوونێكی سـەیر بـوو بـوو.. شـانازی بـەزانین و زانیاریەكەیەوە دەكرد تاویستی خوای گەورە وابوو ڕێنومایی كرد..

جارێكیـان كەسـێكی سـادە هاتــە لای و ئامۆژگـاریی كـرد ئامـادەی كۆڕێكی پەروەردەی دەروونی بێت كەلەلایەن یـەكیٚ لـە شـێخە گـەورەكان لـە شـاخی (قاسـیون) بـەڕێوە دەچـوو. لەسـەرەتادا ئامـادەیی نەنوانـد.. پاشـان خـوای گـەورە سـینەی كـردەوەو چـوو بـۆ ئـەو كـۆڕەو زۆر كاریگەربوو پێی.. بەبەردەوامیی ئامادە دەبوو لەویٚ و لەڕەگ و ڕیشەوە گۆڕانكاریی بەسەردا هات.

ژنەكـەی دەیـوت: { (شـێخ ئـەمین)) ئەگـەر خواردنم بۆ دابنایـەو كـەمێك سوێر بوایە یان كەم خـویٚ بوایە دنیـای دەهێنایـە خـوارەوە، بـەڵام دوای پابەنـدبوونی، خـواردنێكی سـوێرم بـۆ دانـا خەنـدە گرتـی و پێـی ووتم كەمێك خوێم بۆ بێنە تازیانم پیٚ نەگەیـەنیٚ} ئـەم شـێخە دەسـتی كـرد بـە خوێنـدن و زانسـت وەرگـرتن.. زۆرێـك لـە خـەڵكیش سـودمەند دەبـوون لێـی.. لەدواهــەمین ڕۆژەكـانی تەمەنیـدا توشــی نەخۆشـیەك بـوو زۆر بەناڕەحەت دەبزوا، بەڵام بەرگـەی دەگـرت و هەڵدەسـتایەوە تـاوەكو وانـە

بەخەڵکی بڵێتەوە.. لێی ڕوون بوو کە خوای گەورە کارەکەی وون ناکات و بێگومان خوای گەورە لە گومانی باشی بەندەکەیدایەتی پێی، مەرگ بوو بە میوانی شێخ ئەمین لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا، لەوکاتەدا قوتابیەکانی و شێخ ئەحمەدی کوڕی بەدەوریەوە بوون، هەستی بە مردن دەکرد، ئەوانەی دەوروپشتیشی هەستیان بەوە کرد.. دەستیان کرد بە تەلقینندانی بە شایەتومان، ڕووی کرد بەلایانداو پێی دەوتن ((بڵێن: لا إله إلا الله... بڵێن: لا إله إلا الله)) لەبری ئەوەی ئەوان بەم بڵێن... پاشان دەنگی هێواش بوو چاوەکانیشی کزبوون و ئەمیش دەیوت ((یا أیتها النفس المطمئنة* إرجعي إلى ربك راضية مرضية* فادخلي في عبادي* وادخلي جنتي)) الفجر/٢٧-٢٨.

واتە: (ئەی نەفسی بێ ئارام بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگاری خۆت بەڕەزامەندی و لێڕازی بوون، ئینجا بچۆرە ناو بەندە چاکەکانی من، وە بچۆرە ناو بەهەشتی منەوە).

ڕووی کرد بەلای ئەوانەی دەوروبەریدا و بەهەموو توانایەکیەوە ووتی ((السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)) لەوشەوە پیرۆزەدا کە شەوی قەدری پیرۆزبوو وە خێری لە هەزار مانگ زیاترە گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری.. ئای کە مردنێکی جوانە.

# ئایا پەروەردگارمان شایەنی ئەوە نیە

ساڵی ڕابردوو لە قوتابخانەیەکی بیانی بڕوانامەم بەدەست هێنا، وافێرکرابووم کە هەموو شتێ لەم دنیایەدا ئاساییەو ڕێگە پێدراوە.. ئەگەر من لەخێزانێکی میسری و موسڵمان نەبوومایە نەمدەزانی ئێستە حاڵم بەچی دەگەیشت.

ئارەزووی وەرزشم هەبوو.. خەونی گەورەم هەبوو بە ئاینەوە.. هاوڕێیەکی کچم هەبوو کە هەمان حەزو ئارەزووی هەبوو. پاڵەوانی وەرزشی عەرەبی و ئەفریقی بوو.. ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی پابەند بە ئاینەوە (خوای گەورە پاداشتی بداتەوە) پێی ووت: ئایا ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە تا وازبێنیت و بالا بپۆشیت؟

ئەویش ووتی: هێشتا خەونێکی زۆرم هەیە کە نەمهێناونەتە دی! کوڕەکە بەزیرەکیەکەوە کە ئەو هەستی پێ نەکرد ووتی: باشە ئایا ئەگەر کوڕێکی چاك لە هەموو ڕوویەکەوە خوازبێنیت بکات بەمەرجێك کە وازبێنیت و بالا بپۆشیت ئایا ڕازی دەبیت؟ بەخێرایی ووتی: بەڵێ (ئەگەر شایانی ئەوەبێ؟) ڕازیی دەبم! ئەمیش پێی ووت: ئایا پەروەردگاری ئێمە شایانی ئەوە نیە؟؟ بێگومان نەیتوانی وەڵام بداتەوە.. بەڵام سەیر لەوەدا بوو ئەم قسەیە کاری تێنەکرد.... سوپاس بۆ خوا شوێنەوارێکی قوڵی لەناخی مندا بەجێهێشت.. تا ئەو ڕادەیەی کە چوومەوە بۆ ماڵەوە خۆم تاقی دەکردەوە بەسەرپۆشەوە! هەرچەندە سەرپۆشیش نەدەبووم بەخۆم، وە جلی گونجاوم نەبوو.... بۆ ڕۆژی

دواتر هەنگاوێکم بۆنا ئەویش نوێژکردنی هەینی بوو.. سوور بووم لەسەر ئەوەی هەرچەندە ڕەخنەم ئاراستە بکرێت ئەوە بۆ ساتێکیش وازناهێنم لەو ڕێنماییەی خوای گەورە پێی بەخشیوم، لەوانەیە ئەو لاوە هەتا ئێستاش نەزانێت کە هۆکارێکی ڕاستەوخۆبووە بۆ ڕێنمایی کردنی من.. من ئێستا وازم لە وەرزش هێناوە کە حەزیشم لێ دەکرد.. پەیمانەکەی خوا ڕاست بوو گێڕامی بە ئیماندارێك کە هەست بە شیرینیەکەی بکەم لە دڵمدا...

# کتێبێك ڕێنمایی کردم

بەبێ باسکردنی سەرگوزشتەی درێژیی خۆم.. بەهۆی چەند هۆکارێکەوە کە خوای گەورە دەیزانێت.. ئەگەر یەکێکیتان وویستان تێبگات لە نهێنیەکانی ژیانی و حەقیقەتی شتەکانی بۆ دەرکەوێت و چەندین حەقیقەتی تریش لەناخیدا، وە ئاشنابێت بە کۆمەڵێ کەس کە فریشتەش نەبوون و مرۆڤیش بوون، بەلام دەیانزانی بۆچی دروستکراون و چارەنوسیان بەرەو کوێ دەڕوا و کام ڕێگایە بگرنەبەر کە دەرونیانی پێ ڕەزامەندبێت.. هاوڕێی ئازیزم ئەگەر دەتەوێ عەموو ئەمانە بزانیت ئەوە پێویستە کتێبی ((رجال حول الرسول-پیاوانی دەوری پێغەمبەر)) بخوێنیتەوە کە لە نوسینی (خالد محمد خالد)ە لەوکاتەوەی ئەو کتێبەم خوێندوەتەوە ژیانم بەتەواوەتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە..

سوپاس بۆ خوا شەرمم لەو پیاوانە دەکرد کە بە دەوری پێغەمبەرەوە ﷺ بوون.. پاشان شەرمم لە پێغەمبەر خۆی دەکرد پاشان شەرمم لە خوای پەروەردگار دەکرد.. هەموو دوعا و داوایەکم ئەوەیە کە من و ئێوەش وەربگرێت لە ڕیزی بەندە باشەکانی.

# سەرپێچی

کاتێ چاوم بەدنیادا کرایەوە باوکمم بینی نوقم بووە لە ئارەزواتدا.. رادەبوێرێ و دەچێتە دەرەوەو لەگەڵ هاورێکانیدا مەی دەخواتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، داوای هەرچییەکمان لێ بکردایە دەستی نەدەنا بەرووەمانەوە، بەلام بەمەرجێك سەرپۆش نەکەین، هەمیشە گاڵتەی بەو ئافرەتە دەهات کە بالای دەپۆشێت.. سووربوو لەسەر ئەوەی هەر مۆدێلێکی تازەبێت بیکەینە بەر.. ئیتر ئایا بگونجێت لەگەڵ نەرتماندا یان نا.. بەتەواوی سەربەستی کردبووین (بەتایبەتی چوونە دەرەوەو شەو بێداریی).. پێی وابوو هاورێیەتی نێوان کورو کچ شتێکی شارستانیە، لەبەر ئەوە ئێمە لەگەڵ هاورێی براکانماندا دادەنیشتین.. بەلام لەولاشەوە دایکم ئەم هەڵس و کەوتەی بەتەواوەی پێ خۆش نەبوو.. واتە لەهەندێکیدا قسەی دەکردو لە هەندێکیشیدا بێدەنگ دەبوو .. بەحوکمی ئەوەی باوکم زۆر حەزی لەسەفەرکردن بوو لەگەڵ هاورێکانی (بۆکاری خراپەو رابواردن) دایکیشم بەمەی دەزانی بەلام دەیوت مادام دوور لەماڵەوە کاری خراپ دەکات قەیناکا؟ باوکم سەفەری کردو سەفەرەکەی زیاد لەمانگێ درێژەی کێشا.. دوای ئەو ماوەیە، هاورێیەکی لەو شارەوە کە سەفەریان بۆ کردبوو پەیوەندی پێوە کردین تاوەکو هەواڵمان پێ بدات کە باوکم سبەینێ دەگاتەوە لامان بەلام... بەمردوویی!... دوای بیستنی هەواڵەکە وامان لێ هاتبوو بروامان نەدەکرد؟ ئەو لەوپەری تەندروستیدا بوو.. رۆژێ لە رۆژان گرفتاریی شتێك نەبوو بوو؟ زۆر گریاین.. بەتایبەتی من چونکە بچوکی هەموان و نازپێدراوبووم و هیچ داواکاریەکم رەت نەدەکرایەوە..

هەرکـە تـەرمی بـاوکم گەشـتەوە کـەوتم بەسـەریداو زۆر بەخەسـتی دەگریام.. ڕۆژانی تەعزیەو ماتەمینی تەواو بوو.. پەیوەندیم بەهاوڕێ خۆشەویتەکەی باوکمەوە کرد کە سەفەری کردبوو لە گەڵیدا... پێیان ووتم لەمزگەوتەو جیانابێتەوە لێی زۆر کەم نەبێت منیش سەرم سوڕمابوو لەو هەڵوێستە کت و پڕە کەبەسەریدا هاتووە کاتێ هەوڵی زۆرم دا بیبینم.. هاتەوەو ڕوخساری تێك چوو بوو پێم ووت مامەگیان: دەمەوێ پێم بڵێی باوکم چۆن مردووە... دەستی کرد بە گریان.. سوێندم بۆ خوارد و پێم ووت: من بڕوا بەو قسانە ناکەم کە لەبارەی باوکمەوە دەڵێن. (بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل بووە) ...دوای پێداگرتنێکی زۆر.. کارەساتم بیست.. وتی: من و ئەو شەومان بەسەر برد و مەیمان دەخواردەوە و کچانمان لەگەڵدابوو.. ووتم: ئەو کچەی لەگەڵ مندایە جوانترە لەو کچەی کە دێت و لەگەڵ تۆدا دادەنیشێت.. ووتی: تۆ هێشتا نەت بینیوە.. ئێستا دێتە ژوورەوە.. کاتێ هاتە ژوورەوە لەوپەڕی جوانیدا بوو.. باوکت هەستایەوەو پاشان سوجدەیەکی برد بۆ جوانی ئەو ئافرەتە.. کاتێ کە لەسوجدەدا بوو.. من بانگم دەکرد بەڵام وەڵامی نەدەدایەوە.. زیاد لە جارێ بانگم کرد هیچ نەبزوا.. چووم ڕایوەشێنم بینیم مردووە.. لەکاتی سوجدەبردن بۆ ئەو کچەدا مرد.. دوای ئەوەی گوێم لەو کۆتاییە چارە ڕەشەبوو زۆر گریام...

چەند ڕۆژێك هەر دەگریام، پاشان دەست نوێژم گرت و نوێژمکرد.. وە داوای لێخۆشبوونم بۆ کرد.. پاشان حیجابم پۆشی.. داوام لە پەروەردگارم کرد کە ئایندەی کردەوەکانم بەچاك بگێڕێت... خوایەگیان... ئامین.

# مردنم بینی

ژیانی مرۆڤ بەچەندین هەڵوێستدا دەڕوات کە بەشێوەیەکی دروست کاریگەریی دەبێت لەسەری (یا کاریگەرییەکەش کاتیی بێت).. وای لێدەکات بگەڕێتەوە بۆلای خواو هەست بە مەزنی و گەورەیی و فەزڵ و ڕەحمەتی ئەو زاتە بکات بەسەر بەندەکانیەوە.. لەم بەسەرهاتەدا یەکێ لەو سەڵوێستانەتان بۆ باس دەکەم تاوەکو ئاشنابن بە فەزڵی خوای گەورە بەسەرتانەوە..

لەڕۆژێکی وەرزی هاویندا من ماوەی مەشقکردنم بەسەر دەبرد لەیەکێ لە کۆمپانیا مەزنەکانی داودەرماندا، یەکەم ڕۆژی مەشقکردنم بوو.. لەنیوەڕۆدا هەستم بە کەمێك ناڕەحەتی و بێتاقەتی کرد، بەڵام دانم گرت بە خۆمداو وام زانی بێتاقەتیەکی سادەیە، بەڵام لەکاتی ڕێگاکردندا ماندوێتیەکەم زیادیکرد و هەستم بە لەرزینێکی سەخت کرد لە جەستەمدا، تا ئەو ڕادەیەی نەم دەتوانی ڕێبکەم، پەیوەندیم کرد بە براکەمەوە، بۆ ئەوەی بێت و بمگەیەنێتەماڵەوە، هەرچەندە ئەوشوێنەی من قسەم تیادا دەکرد لەگەڵ براکەمدا نزیك بوو لە ماڵمانەوە، زۆر دواکەوت نازانم هەر بەڕاستی دواکەوت یان نا.. بەڵام من هەستم کرد کە ناتوانم چاوەڕوانیشی بکەم، زۆر بە ناڕەحەت ئۆتۆمبێلێکی تەکسیم ڕاگرت تا بمگەیەنێتە ماڵەوە، کاتێ چوومە ژوورەوە هیچ قسەم نەکرد، بەڵکو چوومە ژورەکەی خۆم و خۆمدا بەسەر جێگەکەمدا.. وورده وورده هەستێکی سەیرم لا دروست بوو.. ئەوە مردنە!!!

هەستمکرد خەریکە گیانم لە جەستەم جیا دەبێتەوە تا ئەو ڕادەیەی هەست بە بوونی قاچم و دەستم ناکەم.. هەستێکی سەیرم لا دروست بوو.. هەرچیم خواردبوو هەڵم هێنایەوە... زۆر بەناڕەحەتیەوە هەستام تاوەکو دەست نوێژ بگرم و دوو ڕکات نوێژ بکەم.. ئاه، مردن چەندە نزیکە لێمانەوە، لەهەر ساتێکدا بێت یەت... ئایا کاتێك بۆت دێت کە تۆ گوێڕایەڵی خوا دەکەیت، یان پەنا بەخوا سەرپێچی خوا دەکەیت؟

دوای نوێژ هیچم شك نەبرد بیکەم تەنها ئەوە نەبێ خۆم بدەم بە دەستەوەو تەواو دڵنیابووم کە ئەوە مردنە... لەسەر زەویەکە خەوتم و ڕوومکردە قیبلە ((ڕەوگە)) هەستم دەکرد بەگیانم کە دەردەچێت لە قاچمەوە بۆ ئەژنۆم پاشان لەدەستمەوە تا گەیشتە بینەقاقام...

لێدانی دڵم وەستاو هەروەها هەناسەدانیشم وەستا.. لەوکاتەدا دایکم و خوشك و براکانم خۆیانکرد بە ژووردا.. زۆر بەهێزەوە ڕایان دەوەشاندم و بانگیان دەکردم.. بەڵام تازە پاش چی.. وەڵام نەبوو.. دایکم بە براکەمی ووت کە بڕوات پزیشك بێنێت.. من بەخۆمم دەوت پزیشك چی دەکات؟.. نەڕۆی برام هیچ سودێکی نیە. شریتی یاداوەری بە بیروهۆشمدا دەسوڕایەوە.. من چەندجار گوێڕایەڵی خوامکردووەو چەند جار سەرپێچیم کردووە؟ چیم کرد بە دنیا؟ ئایا دنیا مەبەست بوو یان هۆکار بوو؟ کوا هاوڕێکانم؟ کوا ئەو هێڵە وەنەوشەییانەی بۆ ئایندەی خۆت دەتکێشا؟ چی.. و چی.. و چی.. پزیشك هات.. دوای پشکنین و تەماشاکردن ووتی: بێئومێد مەبن.. من هەستم دەکرد کەبەتەواوی چووم بۆ ئەو دنیا.. ئەم پیاوە هیچ سودێکی نییە.. پزیشکەکە ئیسپرتۆی بەکارهێنا تا بەئاگا بێمەو.. بۆچەند ساتێ بەئاگاهاتمەوە بەڵام جارێکی تر کەوتمەوە.. چەند ووتەیە بەزارمدا

دەهات بۆ نموونە.. تەواو.. وازم لێبێنن.. جارێکی تر بە ئاگا هاتمەوە و دووبارە کەوتمەوە.. بۆ جاری سێیەم بەئاگا نەهاتمەوە، پزیشکەکە جارێکی تر هەوڵی دایەوە و منیش بە ئاگا هاتمەوە.. بەڵام هەستم لێبڕابوو، هەستم کرد کە چەند ساتێکی کەمەو مەرگ بە دڵنیاییەوە بوەتە میوانم.. نەمزانی دوای ئەوە چی ڕوویدا بەڵام بۆ نزیکەی (١٥) سەعات خەوتم پاشان بە حاڵەتێکی کەمێك باشترەوە خەبەرم بوویەوە.. چووم بەقۆناغی چارەسەرکردندا...

پاشان ڕاهاتنەوە لەگەڵ دنیادا.. بەڵام هەرکاتێ قیامەتم بیردەچێت بیر لەو کارەساتە دەکەمەوە تاوەکو بزانم کە چەندە پەروەردگارم میهرەبانە.. وەچەندە مردن نزیکە.. لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو تیبێبینی پزیشکەکان.. چونکە من دڵنیابووم کە ئەو کارەساتە ئاگادارکردنەوەیە بوو لە خوای گەورەوە بۆ من تاوەکو لە تاوان دوور بکەومەوە و لەکۆتاییدا بگەڕێمەوە بۆلای پەروەردگارم.. داواکارم لێتان ئەم چیرۆکە بێتە پەند و ئامۆژگاریی و تێگەشتن لە ماناکانی و هەموو شتێك تەواو دەبێت (پشت بەخوای گەورە) تەنها کردەوەی چاك نەبێت..

# ماددە بێهۆشکەرەکان

ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە لەواقیعی ئازاراویماندا ڕوویداوە، ئەوەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە بەسەر خۆیدا هاتووە.. تەنها فرمێسك بەس نیە، هەزار جار مردنیش یەکسان نیە بەیەك (ئاە) کەلەناخی بریندار دڵی دەردەدارەوە بێتە دەرەوە.. ئێستە من زانیومە کە (بەختیار ئەوکەسەیە پەند لە کەسی ترەوە وەربگرێت، وە سەرکەشیش ئەو کەسەیە کە خۆی بکات بەپەند).. ئافەرین بۆ ئەو کەسەی ئەوەی ووتوەو ئەوەی کە کاری پێ دەکات..

ئەوە ئازارەو ئەوە پەشیمانیە لەسەر هەموو ساتەکانی ژیان، هەرکە ڕۆژێکی نوێ دەست پێدەکات ئازارەکانی منیش دەست پێدەکات.. هەموو ساتێك بەڵکو هەموو چاوتروکانێك هەموو شتێك لە دڵمدا دەسوتێ..

ڕۆژانە زۆرجار بەڵکو هەزارەها جار دەمرم.. کەسیش پێم نازانێت و کەسیش ئاگای لێم نیە تەنها خوای گەورە نەبێت، من هەموو شتێ کە بنیاتنرابوو بۆی ڕووخاندم و ئازیزترین شتێ کەهەیبوو تێکمدا.. بەڵێ بەم دوو دەستە تاوانبارە پیسە نەفرەت لێکراوە.

خوایەگیان بیرکردنەوە چەندە سەختە.. خوایەگیان دەردیسەری چەندە نارەحەتە، لەهەموو بەرەبەیانێکی نوێدا ئازارەکە و ماتەمیەکە لەهەر سوچێك لە سوچەکانی ئەمماڵەدا نوێ دەبێتەوە.. لەناخمدا هاوار

دەکـــەم ئەگـــەر دەری بـــبڕم ئـــەوە دیوارەکـــانی بـــەردەمم دەڕوخـــێن و دەسوتێن..

ئەگـەر شـەو بـاڵ بکێـشێت بەسـەر ئاسمـانی ڕۆژدا و دایپۆشـێت، و شەوی نهێنیەکان دەست پێبکات ئەوەی کە عاشقان بەدوایدا دەگەڕێن، و گۆرانیبێـژان گـۆرانی بەسـەردا دەڵـێن و شـەونخونیکەران پەشـیمانن لەسـەری، هـەزارجار دەگـریم و هـەزار جـار ئـاخ هەڵئەکێـشم چـونکە زیندووم و تائێستا ئەژیم، دەمەوێ بمرم بەڵام ناتوانم، لەوانەیە بەهۆی ئـەوەوەبێ ترسـنۆکم یـان نامـەوێ هەڵەکـە دووجـار دووبـارە بکەمـەوە، بـەڵکو خـوای گـەورە لێمخـۆش بێـت لـەوەی کـە لـەژیانی ڕابردوومـدا کردوومـە بـەڵکو لـەتاڵاوی ڕابـردووە، زۆرێـك لـەزەت لـەڕابردوو و یادگاریەکانیان دەبینن و حەز دەکەن باسی بکەن تەنها من نەبێ، دەزانن بۆ...؟

نامەوێ پێتان بڵێم چونکە دەترسم نەفرەتم لێ بکەن، و دوعام لێبکەن زیـاتر لەپاڕانـەوەکانم و نـەفرەتکردن لـەخۆم، لەوانەیـە پیاوچاکێکتان تێدابێت دوعاکەی گیرابێت و خوای گەورەش بەهۆی دوعاکەی ئەوەوە سـزام بـدات و بـە نـەفرەتی خـۆی نـەفرەتم لێ بکـات.. بمبـورن ئەگـەر قـسەکانم ناڕێـك بـن و ڕێـك نـەخرابن.. چـونکە مـن دەردەدارم، هـەر ناڕەحەتیـەك کـە سەرپەرشـتیم کـردووە ناڕەحەتیـەك بـووە بـەڵکو دوان بەڵکو سیان بەڵکو زیاتر، من ئەو کەسەبووم هەموو شتێکم فرۆشت و هیچیـشم دەسـت نەکـەوت.. سـوێند بـەخوا بەسـەرهاتی خۆمتـان بـۆ دەگێڕمـەوە تـەنها لەبـەر ئـەوەی هۆشـیارتان بکەمـەوەو ئاگادارتانکـەم، ئاگادارتانکـەم تـا نەکەونـە ئـەو حاڵەتـەوە کـە مـن تێیکـەوتووم، سـوێند بـەخوا خامەکـەم شـەرم دەکـات لـەوەی کـە مـن دەمـەوێ بینووسـم، وە

پەنجەکانم هەزار جار دەیانەوێ ڕێگام لێبگرن بەڵام من هەر بەسەرهاتی خۆم دەنووسم، بەڵکو بەهۆیەوە خوا چاکەم بۆ بنوسێت و بێتە توێشووم لەڕۆژی دواییدا.. لۆمەم مەکەن و گوێ لەبەسەرهاتم بگرن و حوکم بدەن و پەند و ئامۆژگاری وەربگرن پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ.

من لاوێکی گوزەران باش بووم لە خێزانێکدا کە خوای گەورە ڕەوشت و ڕۆزیی و چاکەو پیرۆزیی بۆ نووسیبوو، لەوکاتەوەی کە گەورەبووین پێکەوە دەژیاین و یەك ماڵ گلێری کردبووینەوە کە پڕبوو لە بەختەوەری و پێکەوە ژیان و خۆشەویستی، لەماڵەوە دایکم و باوکم و دایکی باوکم و براکانم کە شەش برابوون و من حەوتەمیان بووم و لەهەموویان گەورەتر بووم.. دووەمیش بووم لەناو هەموویاندا، چونکە خوشکێکم ساڵێك لەمن گەورەتر بوو.. من دوای باوکم پەروەرشیاری دووەمی ماڵەوە بووم هەموام زۆر پشتیان پێ دەبەستم.. بەردەوام بووم لەخوێندن تاگەیشتمە دووی ناوەندی ..خوشکەکەشم لەسێی ناوەندی بوو.. هەموو خوشك و براکانی ترم بەردەوام بووین.. ئاواتەخوازبووم ببمە ئەندازیار، بەڵام دایکم حەزی دەکرد ببمە فڕۆکەوان.. باوکیشم لەگەڵ مندابوو دەیەویست ببمە کەسێکی زانکۆیی و پسپۆڕبم لەهەر بوارێکدابێت.. خوشکەکەم دەیەویست ببێتە وانەبێژ تا ئایین و ئەدەب فێری نەوەکان بکات...

بەڵام ئای لە ئاوات و خەونەکان و ئومێدەکان.. چەندین کەس پێش ئەوەی خەونەکانیان بێتە دی لەژیاندا نەمان، چەندین کەس بێتوانابوون لەهێنانەدی خەونەکانیان بەهۆی بارودۆخی خۆیانەوە، وەچەندین کەسیش خەونەکانیان هێناوەتەدی، بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە خەونەکانمان

نەهاتە دی بەشێوەیەك كەبڕوا ناكرێت و بەبیروهۆشی نە عاقڵ ذەشێت نەهیچ كەسێكدا نایەت.

لەقوتابخانەكەم ئاشنابووم بە كەسانێك وەك هەنگوین و قسەكردنیان و هەڵسوكەوتیان وەكو هەنگوین وابوو بەڵكو بەتامتریش... چەندین جار هاوڕێیەتیم كردن و بەدزی كەس و كارم چەندجارێ لەگەڵیان دەبووم، خوێندنەكەشم بەردەوام بوو حاڵەتیشم لەوپەڕی باشیدابوو، من هەوڵی زۆرم دەدا تاوەكو هاوڕێكانم و خوێندنم پێكەوە گرێ بدەم.. لەنیوەی یەكە دا توانیم وابكەم.. پاشان مۆڵەت دەستی پێكرد ئای لەچ مۆڵەتێك، خوای گەورە نەمۆڵەتی واو نە ڕۆژی وا نەگێڕێتەوە...

باوكم هەستی كردبوو چوونە دەرەوەم زیادی كردووە و كەمتر ئَرنگی بە ماڵەوە دەدەم، بۆیە لۆمەی كردم و لۆمەی دایكیشمی كرد.. بەڵام خوشكەكەم بەرگری لێدەكردم، چونكە زۆر منی خۆش دەویست لەوە دەترسا باوكم لێم بدات، چونكە لێدانەكانی سەخت بوون ئەگەر توڕە ببوایە، ڕۆژانی پشوو گوزەشتیان دەكرد لەگەڵ شەوەكانیدا، ئەگەر بمزانیایە چۆن كۆتایی دێت خۆم دەكوشتەوە بەڵكو جەستەم پارچە پارچە دەكرد و بەردەوام نەدەبووم، بەڵام ئەوە ئیرادەی خوایە...

من و هاوڕێكانم لەپشتەوەی ماڵی یەكێ لە هاوڕێكانماندا بووین، بانگی كردبووین بۆ بینینی ڤیدیۆو یاریكردن پێكەوە، بۆیە لەمەغریبەوە دانیشتین تاوەكو سەعات یانزەی شەو، ئەوكاتەش كاتی گەڕانەوەم بوو بۆ ماڵەوە لەو ڕۆژانەدا، بەڵام خاوەن ماڵەكە داوای لێكردم كە بۆ نیو سەعاتی تر دانیشم، پاشان هەموومان بچینەوە بۆ ماڵی خۆمان، ئایا دەزانی نرخ و بەهای ئەو نیوسەعاتە چەند بوو،

بـەهای تەمـەنم بـوو، نـەخێر بـەهای مـن و بـاوکم و دایکـم و هـەموو خێزانەکەم...

بەڵێ هەموویان، ئەو نیوسەعاتە بەهای هەمووژیانمان بوو، بەهای گواستنەوەمان بوو لەبەختەوەرییەوە بۆ بەدبەختی هەتا هەتایی، بەڵکو ئەو نیوسەعاتە خۆم ئامادەکرد تا بگوێزمەوە بۆ ئاگرێك داخمان کات، تەنها بۆ کەسێکە کە بەدبەخت بێت، داوای لێبوردنتان لێ دەکەم چونکە لەباسەکەم چوومە دەرەوە.. یەکێ لە هاورێکان خۆی تەرخان کرد قۆریەك چا ئامادەبکات تاوەکو کاتی پێوە بەرینە سەر.. چاکەی هێناو خواردمانەوەو قسەمان دەکرد و شۆخی و سوعبەتمان دەکرد، بەوپەری بەرائەت و نیەت پاکیەوە، بەڵام دوای ئەوەی چاکەمان خواردەوە.وامان لێهات بەلادا دەکەوتین و پێدەکەین و دەرشاینەوە بەهەموو شێوەیەك، هەموومان بەڵێ هەموومان... ئاگام لێ نەمابوو چیمان لێهاتووە، تاوەکو یەکەمین کەسمان کە بە ئاگاهاتەوە ئێمەشی بە ئاگا هێنایەوە.. خاوەن ماڵەکە هەستاو لۆمەو سەرزەنشتی کردین لەسەر ئەو کردەوەیەمان، ئێمەش هەستاینەوە و نەماندەزانی چی روویداوەو بۆچی و چۆن ئەمە روویدا، سەرزەنشتی ئەوەمان کرد کە چاکەی ئامادە کردبوو، ئەویش لەوەڵامدا ووتی: ئەوە شۆخیەك بوو کردمان، خۆمان و شوێنەکەمان پاك کردەوەو چووینەوە بۆ ماڵەوە..

لەگەڵ جریوە جریوی چۆلەکەدا گەشتمە ماڵەوەو هەموو خەوتبوون تەنها ئەو خوشکەم نەبێ کە بردیمە ژوورەکەی خۆیەوەو ئامۆژگاری و هەرەشەی لێکردم کە ئەمە کۆتاهەمین جاربێت دوابکەوم لە ماڵەوە.. منیش پەیمانی ئەوەم پێدا، ئەو هەژارە نەی دەزانی کە ئەمە پێشتر

هەرەشەیە بۆ ژیانی ئەو نەك من.. خۆزگە نەبورایە لێم و لێیبامایە بەڵکو بیکوشتمایە.

دوای چەند رۆژێ لەلای هاورێیەکمان کۆبووینەوە... داوای ئەو شۆخی و سوعبەتەمان کردەوە چونکە حەزمان لێدەکرد و عاشقی بووبووین.. هاورێکەمان پێی وتین کە ئەوە گرانە و بەنرخێکە کەس ناتوانێ بەتەنها بیکرێت.. بۆیە پارەمان کۆکردەوە و بەپێی ژمارەی خۆمان کەپسولەکانمان کری.. واگومان دەبەم ئێستا بزانن ئەو شتە چییە.. مادەی بێهۆشکەر.. شۆخی و سوعبەت بوو ..بەدنکە حەبێکی مادەی بێهۆشکەر و ئێمەش نەمان دەزانی.. هەندێکمان بەهۆی ئەو گاڵتەو پێکەنینەو ئەو دەنکە حەبە بەرەو سەرگەردانی رۆشتین..

رێکەوتین لەسەر کاری نۆبە.. بەدوو هەفتە جارێ یەکێکمان پەیدای کات و پارەکە کۆبکەینەوەو حەبەکان بکڕین.. رۆژان گوزەران و بارودۆخم لەخوێندنگا بەرەو خراپی چوو.. بۆیە باوکم گواستمیەوە بۆ قوتابخانەیەکی ئەهلی بەڵکو سەرکوتووبم و دواناوەندی تەواو بکەم، خەونەکانی من و ئەویش و خەونی دایکیشم بوون بە هەڵم.. فرۆکەوان چ فڕۆکەوانێك چ ئەندازیاریەك لەمن دەخوازرێت.. سوێند بەخوا تاوانی من نەبوو، وە نەمئەزانی.. ئەگەر کارەکە پێشنیار بکرایە بۆم رەتم دەکردەوەو سەری خۆم هەڵدەگرت بەڵام گاڵتەو سوعبەت بوو..

نەفرەتی خوا لەو کەسەی ئاوا گاڵتەو شۆخی دەکات بەلاوانی موسڵمان.. رۆژان دەگوزەران و ئێمەش بەردەوام لەسەر ئەو حاڵە کۆدەبووینەوە، کەس نەیدەزانی و کەس هەستی نەدەکرد چی رووردەدات.. وام لێهاتبوو نەمدەتوانی دوور کەومەوە لێی نە لەمە نە لە هاورێکانم.. ئەنجامی کۆتایی ساڵمان وەرگرتەوە کە چاوەڕوان نەکراو و

کارەسات بوو بۆ هەموو کەس و کارم.. بەڵام ئەوەی کە هێوری کردینەوە خوشکەکەم بوو کە دەرچوو بوو بە پلەی (تقدیر عالی) ..پیرۆزبێت.. لەناخی دڵمەوە ووتم هەرچەندە من ئەوەشم بەسەرداهاتبوو.. ووتم و بۆیەکەمجار و بۆ دواهەمین جار لەناخمەوە هەستم بە خۆشی کرد.. ووتم پێی: چیت دەوێ بۆت بکڕم بەبۆنەی سەرکەوتنتەوە.. ئەزانی: ووتی چی.. وەك ئەوەی لەگەڵ من و هاوڕێکانم ئامادەی دانیشتنەکانمان بووبێت، وەك ئەوە بەحاڵمان بزانێت.. وتی: دەمەوێ ئاگات لەخۆت بێت برای بەڕێزم.. تۆ دوای خوای گەورە پشت و پەنای منی.

ئەو ڕۆژە چەند ووشەیەکی ووت نەیزانی دەبێتە یاداوەریەك بۆ من بەدرێژایی ژیانم سەختتر لە لۆمەکردن.. خۆزگە وای نەوتایە و خۆزگە منیش پرسیارم لێنەکردایە..

چ کۆمەك و پشتیوانیەك لەمن داوا دەکەیت (خوای گەورە باشترین پشتیوان و بریکارە)

(حسبی الله ونعم الوکیل) خوشکەکەم چووە پەیمانگای مامۆستاینی کچانەوە وتێدەکۆشاو هەوڵی دەدا... منیش دەکەوتم و دەکەوتم... لەسەرەڕۆیی و تاریکیەوە بۆ سەرەڕۆیی و تاریکی.. لەخراپەوە بۆ خراپتر.. بەڵام کەسووکارم نەیاندەزانی و ئێمەش زیاتر سەرەڕۆبووبوین.. تا ئەو ڕادەیەی نەماندەتوانی زیاد لە دوو ڕۆژ دەستبەرداری ئەو حەبە ببین.. هاوڕێیەکم بەڵکو دوژمنێکی نەفرەت لێکراو بەڵکو شەیتانی نەفرەت لێکراو پێی وتین شتێکی تر هەیە خۆشتر و بەتامتر و درێژخایەنترو بەختەوەرترە، گەڕاین بەدوایدا..دەستمان کەوت.. بۆیە پارەیەکی زۆرمان بۆ گلێر کردەوە..

هەموو ئەمانە لەگیرفانی باوکمان کە نەماندەزانی ئەوانیش بەشدارن لەفەوتانی ئێمە یان نا.. ئایا تاوانبارن یان نا؟؟!!..

جارێکیان کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە خوشکەکەم هەستی بەحاڵەتی من کرد و گومانی لێ پەیدا کردم، و وازی لێهێنام بخەوم، بەیانی هات و لەژوورەکەمدا قوت بوویەوەو ئامۆژگاریی کردم و هەڕەشەی لێکردم کە باسی دەکات ئەگەر ڕاستی پێ نەڵێم...

دایکم هات بەسەرداو ئێمەش قسەکانمان بڕی، دایکم ناردمی چەند پێداویستیەکی بۆ بێنم، منیش چووم و وام لێهاتبوو لە خوشکەکەم ڕامدەکرد لەترسی ئەوەی ئەو شتەی کەساڵێکە بەپەنهانی دەیکەم ئاشکرابێت.. قسەم لەگەڵ هاوڕێیەکمدا کرد، پێکەوە چووین بۆ ماڵی هاوڕێیەکی ترم.. برێك تاوانمان بارکرد.. ڕوداوەکەم بۆ باسکردن.. ئێمەش ترساین لە ئاشکرابوونی و قسەی خەڵکی.. بۆیە بیرمانکردەوە بەڵکو شەیتانەکانمان بیریان کردەوەو یەکێکیان پێی ووتم :چارەسەرم لەلایە.. چارەسەر چیە.. ئایا دەزانی.. ئەگەر لەشەیتانم بپرسیایە هەرگیز ئەوە بەخەیاڵیدا نەدەهات.. ئایا دەزانی چی ووت؟ ئایا دەزانی؟

چۆن بیری کردەوە... کەس گومان نابات چی ووتبێت!! ئایا ووتی بیکوژین؟ خۆزگە وای بوتایە.. ئایا ووتی بیسوتێنین؟ نەخێر بەڵکو لەوە خراپتر.. ئایا دەزانی چی ووت؟؟

حسبي الله ونعم الوكيل.. خوای گەورە باشترین پشتیوان و بریکارە دژی ستەمکاران و بێهۆشان، وە ئەوانەی دەیکڕن و دەیفرۆشن، خوا پەنامان بدات لەو هاوڕێیەم وە خواپەنامانان بدات لە منی نەفرەت لێکراو.. خوایەگیان ئێسکەکانی هەپرون هەپرون کەیت و چاوی

کوێرکـەیت و عـەقڵی لەدەسـت بـدەیت.. خوایـەگیان نەلـە دنیاونـە لەقیامەت ڕێنموونی نەکەیت..

ئایا دەزانن چی ووت.. خراپەو زوڵم و داوێن پیسی و دوژمنایەتی هات بەزاریدا..

ووتی: باشترین ڕێگا ئەوەیە بیهێنینە ڕیزی خۆمان و حەبێکی بدەینێ، ئەوکاتە ناتوانێ کارەکەمان ئاشکرا بکات... بەڵام من ڕازیی نەبووم ئەو خوشکێکی شەریف و داوێن پاك و خۆشەویست و نازداری من بوو.. خوشکم بوو.. بەڵام وەسوەسەیان خستە دڵمەوە.. وە ووتیان ئەو هیچ زیانێکی پێناگات.. حەبەکەی بۆ دەبەیت بۆ ماڵەوەتان و زۆربەڕێزەوە ئەو لەماڵی خۆیاندایە.. و تەنها حەبێك.. تۆباش دەزانیت ئەوەندە کاریگەریی نابێت..

لەژێر کاریگەریی مادەی بێهۆشکەرداو لەژێر کاریگەریی شەیتانەکانیداو شەیتانی خۆم ڕازیی بووم.. هەموو شتێکم لەگەڵیاندا ڕێکخست.. چوومەوە بۆ ماڵەوە.. خوشکەکەم قسەی لەگەڵ کردم داوای لێکردم پێکەوە قسە بکەین.. منیش ووتم چایەك ئامادە بکەو من دان بە هەموو شتێکدا دەنێم.. ئەو داماوە هەستایە تاوەکو چا ئامادە بکات، هەموو ئومێدێکی ئەوەبوو کە کێشەی من چارەسەر بکات.. منیش لەمێشکمدا هەزار شەیتانی وەهمی هەبوو .. پێویستە هەموو ژیانی دارمێنم.. چایەکەی ئامادەکرد و هێنای.. منیش ووتم: چایی بۆ خۆم و خۆت تێکە، پاشان پێم ووت: پەرداخێ ئاوم بۆ بێنە.. هەستاو ڕۆیشت.. کاتێ لە ژوورەکە چووە دەرەوە سوێند دەخۆم بە خوای گەورە بەبێ ئەوەی هەست بکەم فرمێسك بەچاومدا هاتەخوار..

نازانم فرمێسکی خەفەتباریی بوو بۆ ئایندەی خوشکەکەم.. نازانم ڕۆحم بوو لەچاومەوە دەرچوو.. نازانم ویژدانم بوو، نازانم فرمێسکی شادومانی بوو کە من بەوەفام بەرامبەر بەو پەیمانەی داومە بە هاوڕێکانم و ئەو نهێنیەم بۆ هەتا هەتایی پاراستووە.

حەبێکی تەواوم خستە چاکەیەوە.. خوشکەکەم بەخەندەوە گەڕایەوە.. منیش دەمبینی لەبەردەممدا وەك کاوڕێکی بچوك لەناو دارستانێکی پڕ لە گورگدا بەهەموو نیازێکی پاك و دڵگەشەوە.. فرمێسکەکانی منی بینی.. سڕینی و ووتی پیاو نابێ بگری.. هەوڵیدا دڵم بداتەوەو لێپرسینەوەم بکات..

ئەوەی من بیزانم بۆ ئەو دەگریام نەك خۆم، بۆ دواڕۆژی.. بۆ پێکەینەکەی.. بۆ چاوەکانی.. بۆ دڵە سپیە پاکەکەی.. شەیتانی ناخی منیش دەیوت: ئارامبەر.. زیانی پێ ناگەیەنێت.. سبەینێ چارەسەری خۆت و خوشکەکەت دەکەیت.. ئەو پێویستە دەردو ئازاری تۆ بزانێت و بژی تیایدا.. وە بە ئازاری تۆ نازانێت تاوەکو تاقی نەکاتەوە..

بۆیە خەریکی جوانکردنی خراپە و تاوان و داوێن پیسی بوو بۆ من.. حسبی الله.. پێم ووت: باجارێ چاکەمان بخۆینەوە تاوەکو کەمێك هێمن ببمەوە، پاشان باست بۆ دەکەم.. ئەو چاکەی خواردەوە.. خۆزگە نەیدەخواردەوە.. دانیشت منیش قسەم بۆ دەکرد تا لەهۆش خۆی چوو.. جارێك پێدەکەنیم و جارێکیش دەگریام.. نازانم تووشی چی هاتووم.. پێدەکەنیم و دەگریم و فرمێسك بەڕوومەتەکانمەوەیە..

ووردەووردە ئیبلیس وەسوەسەی بۆ دروست دەکردم کە باوکم و دایکم پێم ئەزانن، ئەگەر خوشکەکەم بەو شێوەیە ببینن.. بیرم لەڕاکردن

کردەوە.. بەهەرحاڵ ڕامکرد بۆلای هاوڕێکانم.. مژدەی ئەو کارەساتەم پێدان کە خۆم بەسەر خۆمدا هێنا.. هەموان پیرۆزباییان لێکردم..

وتیان یەکێك پیاونەبێت ناتوانێ کاری وا بکات، تۆ ئێستا سەرۆك و گەورەی ئێمەیت..

تۆ سەرۆکی ئەم گروپەیت.. مافی فەرمان دەرکردن و ڕەتکردنەوەت هەیە.. ئەو شەوە خەوتین بۆ نزیکی نیوەڕۆ لەرزم لێهات بەخۆمم دەوت، چیم کرد بەخۆم.. بەم دەستانەم چیم ئەنجامدا.. دوای دوو ڕۆژ باوکم سۆراخی دەکردم دوای ئەوەی دیارنەمابووم.. هاوڕێکانم نارد تا بزانن لەماڵمان چ باسە.. چونکە دەترسام لەخۆم و لەخوشکەکەم، دڵنیایان کردم کە هەموو شتێ ئارامەو هیچ ڕووی نەداوە.. چووم بۆ ماڵەوە و خۆم ئامادەکردبوو بۆ لێدان و قسە پێ وتن و سەرزەنشت کردن کە هیچ سودێکی نەبوو...

باوکم لێیدام، دایکیشم و خوشکەکەم لۆمەیان کردم، دوای چەند ڕۆژێك خوشکەکەم هات بۆلام و پرسیاری ئەو شتەی لێکردم کە خستبوومە چاکەیەوە.. حەزی لێدەکرد و داوای دەکرد، منیش ڕازی نەبووم.. بۆیە دەستی کرد بە پاڕانەوە.. وەك چۆن من لە هاوڕێکانم دەپاڕامەوە.. منیش بەزەیم پیادا هاتەوەو پێمدا.. ئەم کارە زۆر جار دووبارە دەبوویەوە.. حاڵەتی خوێندنی وردەوردە خراپ بوو.. تا ئەوڕادەیەی بەبێ هۆیەکی ئاشکرا وازی لەخوێندن هێنا.. ئەوانیش ئارامیان گرت چونکە کچ دواهەمین مەنزڵگای هەر ماڵەوەیە..

ئیتر ئومێدیان بەو برایەم هەبوو کە لەمن بچوکتربوو.. جارێکیان من حەبم پێ نەمابوو. بۆیە خوشکەکەم ناچار بوو لەهاوڕێیەکم داوا بکات..

ئەویش نەیدابوویە بەمەرجێك نەبێت.. ئایا دەزانی مەرجی چی بوو (حسبی الله ونعم الوكيل) خواپەنامان بدات لێی و لە شەیتان.

مەرجی ئەوەبوو کە زینا لەگەڵ خوشکەکەمدا بکات.. ئەویش ڕازی نەبوو.. کردبووی بە دەنگە دەنگ لەگەڵی.. ئەو هاوڕێیانەشم کە لەوێ ئامادەبوون دەیانەویست هێمنیان بکەنەوە، و بەمنیان دەوت: چی تێدایە یەکجار زیانی نیە.. لە خوشکەکەت بپرسە ئەگەر ڕازی بێت.. تۆ چ زیانێکت پێ دەگات، و هیچ لەدەست نادەیت.. هەموویان دژی من بوون و لەگەڵ ئەودا بوون..

پێم وت: تۆ یەکەم کەسیت: پێت دەوتم من لەگەڵتدام بۆ چارەسەرکردنی و ڕزگاربوونی خوشکەکەت، بەڵام ئەمڕۆ داوای ئەمە دەکەیت.. ئەمە هاوڕێیەتیەکەت بوو.

پڕ بەدەمی وتی: چ هاوڕێیەتیەك و چ چارەسەرێك، شێخەگیان، لەبیریکە.. بوو بەدەمەقاڵەمان و دورکەوتمەوە لەوێ.. چەند ڕۆژێکم بەو شێوەیە بردە سەر.. من وخوشکەکەم ئارامیمان گرت، خوشکەکەم دەستپێشخەری کردو داوای دەکرد، منیش پێم نەبوو، لەوان زیاتریش کەسم شك نەدەبرد..

حاڵەتی خوشکەکەم خراپتر دەبوو وای لێدەکردم بەلەتە حەبێکیش بێت، شەیتان وەسوەسەی خستە دڵمەوە کە لێی بپرسم، بۆیە منیش بەڕاشکاوانە پێم وت: ئەو تۆی دەوێ یەکەم جار دەیەوێ بتبینێ، پاشان چیمان دەوێ بماندانێ بەبێ بەرامبەر ئیتر جارێکی تر پێویستمان بەکەسی تر نابێ، خوشکەکەم یەکسەر ڕازیی بوو.. ئای خوایەگیان.. ڕۆشتین من و خوشکەکەم پلانماندانا و چوینە دەرەوە.. خوشکەکەم برد بۆلای هاوڕێکەم، و لەشوقەکەیدا دانیشتین..

هاوڕێکەم داوای لێکردم کە کەمێك بڕۆمە دەرەوە تا کاری خۆی تەواو دەکات.. منیش ڕۆشتم خوا نەفرەتم لێکات لە من و لە هاوڕێکەم لەشەیتانەکانم و لەو حەبانەو لەوانەی بەکاری دەهێنن.. دوای سەعاتێك گەڕامەوە.. خوشکەکەمم بەنیوە پۆشتەیی بینی لەشوقەی هاوڕێکەمدا، من تازە پەنەکەم دابوو.. پێکەوە دانیشتین.. من و هاوڕێکەم و خوشکەکەم خوشکی ڕاستەقینەم.. تا دوای عیشا لە دانیشتنێکی خوارنەوەو ڕابواردندا.. هاوار بۆ من لەپەروەردگارم.. هاوار بۆ من لەپەروەردگارم.. هاوار بۆ من لە ئاگرو

من دۆزەخیم.. من دۆزەخیم.. خۆزگە بمردمایە.. خوایەگیان بممرێنە.. خوایەگیان بممرێنە.. من ئاژەڵم.. شایانی ژیان نیم بۆ ساتێکیش بێت.. من و خوشکەکەم گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بە خوشکەکەمم وت: ئەمە یەکەمین و دواهەمین جارە.. ئەو هاوڕێ قیزەونەم جێ ژوان و ژمارەی تایبەتی خۆی دابوو بە خوشکەکەم، پێویست بە من ناکات.

من نەمزانی.. ڕۆژان بەسەرچوون و خوشکەکەمم دەبینی دەڕواتە دەرەوە زیاد لە پێویست.. جاری خۆی جاری لەگەڵ خوشکە بچوکەکەمدا، بەهەر هۆیەکەوەبێ بۆ بازاڕو بۆ نەخۆشخانە تا ئەو ڕادەیەی ڕازی نەبوو جارێکی تر لە پەیمانگا بخوێنێت.

باوکی داماویشم بەهەموو توانایەکیەوە لەڕێی چەندین کەسەوە تاوەکو سەرلەنوێ بیگەڕێنێتەوە بۆ خوێندنەکەی.. خێزانەکەمان سەرلەنوێ دڵشادبوونەوە بە گەڕانەوەی بۆ خوێندنگاو گرنگی پێدان پێی..

جارێکیان من لای یەکێ لە هاوڕێکانم بووم ووتی: با بچین بۆلای یەکێ لەهاوڕێکانمان.. چوین بۆلای ..ئای لەکارەسات.. خوشکەکەمم بینی

لەلای، لەکۆشیدابوو.. بەتاسەوە گریام.. خوشکەکەم هەستایەوە و ووتی: تۆ هەقت چی یە، ژیانی خۆمەو من سەربەستم.. هاوڕێکەم منی برد لەگەڵ خۆیداو ئەو ژەهرێکی یامێ کە مرۆڤ ئازیزترین شتی لەبیردەچێ و لەبەرچاوی لێ دەکات بە ناشرینترین و قێزەونترین شت..

گەڕاینەوە بۆلای هاوڕێکەمان، منیش لەوێ بووم و، یاریان دەکرد لەگەڵ خوشکەکەمدا، منیش لەنێوانیاندا وەکو چوارپێ وابووم ،بەڵکو خراپتریش ،وەنەفرەتیان لەژیان و چارەنوس دەکرد.

لەگەڵ کاتی عەسردا گەڕاینەوە بۆ ماڵ، من نەمدەزانی چی بکەم، داوێنپاکی ڕۆیشت و پارە ڕۆیشت و شەرەف ڕۆیشت و ئایندە ڕۆیشت و عەقڵ ڕۆیشت و بێگومان هەموو شتێك لەدەست چوو.. چەندین ڕۆژ کە بەخەبەر دەهاتم دەگریام کەسەرخۆشیش دەبووم پێدەکەنیم، ژیانێکی ئاژەڵی.. بەڵکو قێزەونترین ژیانی بێ بەهاو پیس و بێ نرخ... جارێ لە جارە شومەکان کە ژیانی من هەمووی شووم بوو.. لەبەرەیانی ڕۆژێکداو لەسەعات نۆی بەیانی پۆلیس پەیوەندی کرد بە باوکمەوە لەسەر کارەکەی و پێیان ووت: خێرا ئامادەبە.. ئەویش ئامادەبوو، بەڵام گورزێك بوو بۆسەر باوکم کە بەرگەی نەگرت و دوای چەند ڕۆژێ وەفاتی کرد.. دایکیشم لەزمان کەوت.. ئایا دەزانن بۆچی؟ ئایا دەزانن؟

خوشکەکەم لەگەڵ کوڕێکدا لەناوچەیەکی حەوانەوەدا لەدەرەوەی شار بەسەرخۆشی تووشی ڕووداوێ بوون و هەردووکیان مردبوون.. ئای کە کارەساتە.. بەرد دێتە گۆو دەگری..

ئای کەکۆتاییەکی ناهەمواربوو.. خوشکی بەڕێزم خەتای تۆ نەبوو تۆ ئەو ڕێگایەت هەڵنەبژاردبوو.. وە ئاواتت هەرگیز بۆ نەدەخواست.. خوشکی داوێن پاکم.. بوویت بەسۆزانیی.. خوشکی بەشەرەفم بویت بە

زیناکـەر.. خوشـکی ئیمانـداری داوێـن پـاکم بـووی بـە بـەرەڵا.. ئـای خوایەگیان.. چیم کرد بەو خوشکەم.. ئەو ڕێگایە چی بوو کە پێی بردمە ئاگری دۆزەخ.. بەدەستم بردم بەرەو نەفرەت لێکردن.. من بردم بەرەو سەرنزمی پەروەردگارم، چی بکەم.. پەروەردگارم، داوات لێ دەکەم کە من ببەیتەوەو سزام بدەیت لە جیاتی ئەو، پەروەردگارم تۆ دەزانیت کە ئەو بێتاوانە، من زوڵمم لەو کردو من ئەوم فەوتاند و ئەو نەیدەزانی..

ئەو دەیەویست من چاك بكات، بەڵام من ئەوم بەرەو خراپە برد، نەفرەتی خوا لە ماددە بێهۆشکەرەکان.. ئەوانەی بەکاری دەهێنن.. باوکم دوای چەند ڕۆژێ وەفاتی کرد.. دایکیشم دوای ئەو ڕۆژە زمانی بەسترا.. منیش هێشتا بەچارە ڕەشی خۆمەوە دەتلێمەوە، و براکانم لەکەناری چاڵێکی تیاچوو دەردی سەریدان.. نەفرەتی خوا لە ماددە بێهۆشکەرەکان و ئەوانە بەکاریدەهێنن..

دوای ماوەیەك بیرم کردەوە کە تۆبە بکەم، توانای ئارامگرتنم نەبوو، ڕوخسەتم لە دایکم خواست کەسەفەر بکەم بۆ هەندەران بە بیانوی گەشت بۆ ماوەیەك کە چەند مانگێ دەخایەنێ، بەبیانوی لەبیرکردنی ئەم کارەساتە.. چووم بۆ نەخۆشخانەی (الأمل) دوای ئەوەی ژیانی خۆم و خێزان و خوشکەکەمم تێکشکاند..

خوشکی بەڕێزم خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات.. پەروەردگار لێی خۆش ببە.. پەروەردگارا، لێی ببورە ئەو داماوەو من لەناوبەرە لەباتی ئەو..

سووربووم لەسەر چارەسەرکردن ،کاتێ پرسیاری ماددەی بێهۆشکەریان لێ کردم.. سوربووم لەسەر ئەوەی کە لەدەرەوە فێربووم..

هەرچەندە هەمیشە لەبەرچاوم بوو، وە دوای چەند مانگێك چارەسەرکرام و ڕزگارم بوو لە ماددە بێهۆشکەرەکان..

بەڵام دوای چی، دوای ئەوەی هەموو سنوورەکانم بەزاند کە ژیانێکی ئارام و بەختیاری بۆ دابین کردبووین.. گەڕامەوە بۆلای کەس و کارم.. بەپیتاکی خەڵکی دەژیاین.. دایکم خانوەکەمانی فرۆشتبوو، خانوویەکی تری گرتبوو بە کرێ لە کۆشکێکی دیلۆکسەوە بۆ شوقەیەکی سێ ژووریی.. ئێمە هەشت سەر خێزان بووین.. دوای ئەو هەموو خۆشگوزەرانیە لەسەر حەسیر دەژیاین..

باسی خەڵکیش با بوەستێ من بێکاربووم، براکانیشم کە لەمن بچوکتر بوون نیوەیان وازیان لە خوێندن هێنابوو، بەهۆی سەختی باری بژێویەوە.. کەس و کارم ئەگەر ناوی خوشکەکەم ببرایە نەفرەتیان لێ دەکرد و قسەیان پێ دەوت و بریندارییان دەکرد.. چونکە ئەو هۆکاربوو لەو هەموو نەهامەتیە.. دەیانخواست بچێتە دۆزەخەوە.. منیش دڵم پارچە پارچە دەبوو بۆی چونکە ئەو بێتاوان بوو... کەس و کاری مینش ئەوەیان نەدەزانی.

وە ناتوانم خەبەر بدەم لە هاوڕێ خراپەکانم ئەوانەی ژیانی من و خوشکەکەمیان داڕوخاند.. چونکە ئەگەر هەواڵ بدەم.. ئەوە برینی کەس و کارەکەم زیاتر دەکات کەهێشتا ساڕێژ نەبووە بەهۆی ئەو کارەساتەوە کەبەسەر خوشکەکەم و باوکم و دایکم و داوێن پاکیماندا و شەرەفماندا هاتووە.. چونکە ئەو کاتە دەزانن من هۆکاربووم و برینەکەیان نوێ دەبێتەوە..

هاوڕێ خراپەکانم منیش تێوە دەگلێنن ئەگەر خەبەریان لێ بەم.. من دۆش داماوم.. هەمیشە دەگریم و کەسیش هەستم پێ ناکات.. من پێم

وایـە دەبـوو بەبـەرد ڕەجم بکرامایـە، ئەمـە بەنیـسبەت منـەوە هـیچ شـتێ نابیّ بەکەفارەتی ئەو تاوانەی من.

تەماشاکەن برایانم بزانن مادده بێهۆشکەرەکان چی بەسەردا هێنام، بەڕاستی قیزەونترین شتە.. شومێکی نەگریسە.. چەند ماڵی تێکدابێت و چەند مرۆڤی سەرەڕۆکردبێت و چەند خێزانی هەڵوەشاندبێتەوە.. برایانم پێمەکەنن و سەرتان سوڕنەمێنیّ و بڵێن پەروەردگار لۆمەی ناکەین.. برایانم پەند وەربگرن و ئەم بەسەرهاتەم باس بکەن بۆ ئەوانەی کە دەیانناسن.. بەڵکو بەهۆی بەسەرهاتی منەوە با تاکە کەسێکیش بێت ڕێنمایی بکرێت.. تاببێتە کەفارەتی ئەو تاوانە مەزنەی من کەوا گومان دەبەم کە پەروەردگارم لێم خۆش نابێت.

داواتان لێدەکەم دوعای خێر بۆ خوشکەکەم بکەن بەشەوو بە ڕۆژ بەڵکو خوای گەورە ڕەحمی پێبکات بەهۆی دوعاکانتانەوە.. چونکە دوعا لەمن وەرناگرێت، چونکە من وام بەسەرهێنا و تووشی ئەو هەموو نەهامەتیەم کرد.. پەروەردگار ڕەحم بە خوشکەکەم بکە پەروەردگار ڕەحمی پیّ بکەو لێی خۆشببەو بە خوا من پێویستم بە هەڵوێستی ئێوەیە لەم نارەحەتیەمدا، بەڵام من هیچم لە ئێوە ناوێت و سوپاسی ئەو برایەم دەکەم کە ئەم ناسۆریەی منی نووسی کەلەبەردەستاندایە و بەهاوڕێی ڕاستەقینەی خۆمی دەزانم و خوا پشتیوانی بێت.

وە سوپاسی ئەوە دەکەم کە بڵاوی دەکاتەوەو باسی دەکات.. ئەمە کورتەی کورتەی بەسەرهاتی من بوو، ئەگەر بەدرێژی باسی بکەم.. ئەوە بێزتان لەخۆتان دەهاتەوە، وە چاوتان لەشەرماندا دادەخست.. بەڵکو ئەمەی کە ووتوومە بەس بێت و بەسوودبێت

# نـــــــاوەڕۆك

## چیرۆکەکانی ڕێنمایی

## چیرۆکەکانی ڕێنمایی




ناو: عمرو محمد حلمی خالید
ساڵی لەدایك بوون:( 1967/9/5)
ئەسکەندەریە میسر.
بڕوانامە: بەکالۆریۆس، بازرگانی-
زانکۆی قاهیرە.
- پەیمانگای دیراساتی ئیسلامی
-کۆلێژی دیراساتی عەرەبی و ئیسلامی
-ماجستێر لەئابووری ئیسلامیدا

ماموٚستا عەمر خالید لەم کتێبەدا کۆمەڵێك چیرۆکمان پێشکەش دەکات بۆ پەند وەرگرتن و باوەڕی وشیارانە لەدڵەکانماندا دەچێنێت وە ئامۆژگاریمان دەکات کە بەوردی بیخوێنینەوە، چونکە لە واقیعی ژیانداو لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ڕوویانداوە. هۆکاری ئەوەش بێگومان دووریە لەپەروەردگار.

نرخی( 3000) دینارە